گۆڤاری

# کۆمپیوتەر

ژمارە

١٤

( تەموز ) ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت - وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات




- چۆنێتی درووست کردنی ئەلبومی ئەلکترۆنی

- نۆرتۆن گۆست و درووست کردنی وێنەیەکی یەدەک بۆ سیستەمەکەت

- چۆنێتی ڕێگە گرتن لە چەتەکانی ئەنتەرنێت ( هاکەرز)

- چی بکەین ئەگەر مۆبایلەکەمان کەوتە ناو ئاو



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر - ٢٠٠٦




# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ١٤

تەموزی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت - وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات




تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لەرێگای سەرنووسەرەوە دەبێت


ناونیشان :
هەرێمی کوردستان/ عێراق - هەولێر . بەرامبەر دەرگای قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شوێنی مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس ی کۆن بۆ هەر پێشنیار و سەرنجێك یان ناردنی بابەتێك .پەیوەندی بکەن بەسەرنووسەرەوە بەم ناو نیشانە . :
دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری - بەرێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر - یان ناونیشانی سەرەوە .
یان بە ژمارە تەلەفۆنی نووسینگەی گۆڤار : 2527054 یان مۆبایلی سەرنووسەر 07504618045

یان پۆستی ئەلکترۆنی :

E.mail: computer_magazine_2005@yahoo.com
aras_co_center@yahoo.com




ئاگاداری :
بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ بڵاو کردنەوە لەگۆڤارەکەمان با بەتەواوی ئاماژە بکەن بەناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە دەینێرن بە پێچەوانەوە ئێمە بەرپرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك.

# پێرست

# ئەو بەرنامانەی
# کە لە ناو سیدی ژمارە ١٤ دا هەیە

ئامادە کردنی: هێرش اسماعیل

## بەشی ANTIVIRUSE




- AVG Anti-Virus v7.1.371
- Spy Kill Deluxe Edition v3.2
- Spyware Doctor v3.5.0.478
- Symantec Norton AntiVirus 2006
- Trend Micro Anti-Spyware v1.0
- Kaspersky Anti-Virus v6.0-2006

## بەشی DESIGEN



- Picasa v2.2
- Fun Morph v2.3
- Photo Filtre v6.2.1
- Surprise Maker v3.3
- ProShow Producer v2.6
- Sothink DHTMLMenu v6.3
- ACDSee Photo Manager V8.0
- Shortcut PhotoZoom Pro v1.092
- Axialis IconWorkshop v6.0 Corporate Edition
- Wondershare Flash SlideShow Builder v1.2.8.0

## بەشی COPY & CD



- AnyDVD v5.8
- Bink v1.0.261
- Ease CD Burner v1.40
- Nero v7.0 PREMIUM
- SlySoft CloneCD v5.2
- SlySoft CloneDVD v3.0
- Audio Data CD Burner v2.92
- Magic Burning Studio 10.0.5

## بەشی DESKTOP



- Photo
- ScreenSaver
- Style XP v3.16
- Analog Clock v2.2
- Vista Start Menu v1.3
- Windows Vista Wallpaper
- Stardock SkinStudio Professional v5.0
- Windows Vista Theme for Windows XP

## بەشی SPECIAL



- 7-Zip v4.32
- FreeRAM XP 4.0
- Active Keyboard 3.1
- BadCopyPro v3.76
- Daemon Tools v4.0
- Folder Lock v5.2.8
- Resgistry Cleaner 1.5
- Windows Vista Fonts
- WinAce Archiver v2.61
- Window Washer v6.0.4
- PC Auto Shutdown v1.8
- Recover My Files v3.7.3
- Uninstaller! 2006 PRO v.5.0
- UnInstaller Platinum Suit v1.1
- Advanced Office Password Recovery Pro v3.04
- TweakNow PowerPack 2006 Professional v1.1

## بەشی INTERNET



- Firefox
- ICQ v5.04
- Skype v2.0
- FlashGet v1.71
- Opera 9.00.8212
- SaveFlash v3.0.61
- MixBrowserb v1.7
- Google Talk v1.0.0.80
- Hide IP Platinum v2.5
- NeoDownloader v2.02
- DU Meter 3.07 Build 200
- IncrediMail XE Build 2140
- Mass Downloader v3.2.0.642
- MSN Messenger v7.5 Arabic
- MSN Messenger v7.5 English
- Yahoo! Messenger v7.0.2.120
- Avant Browser v10.1 Build 168
- Copernic Agent Professional v6.12
- Download Accelerator Plus 8.0.3.5
- MICROSOFT INTERNET EXPLORER v7.0 Beta
- Windows Live Messenger Beta v8.0.0566
- Yahoo! Messenger v7.5.0.333 Beta

## بەشی MULTIMEDIA



- Real Alternative v1.4
- Virtual DJ Studio v4.11
- WinAmp Pro v5.2.0.473
- Ultra DVD Creator v1.3.8
- RM to MP3 Converter v1.21
- WinMPG Video Convert v6.2.1

# بەرنامەی
# Media Resizer PRO

ئا: سەروین هەولێری

ئەم بەرنامەیە یەکێکە لە بەرنامە زۆر ساناکان بەلام بێگومان شتی جوانی لێ دروست دەبێت زۆرجار ئێمە بەرنامـەی وا سـادەمـان دەکەوێتە بەرچاو بەلام ئەگەر لەکارەکانی بکۆلینەوە دەبینین شتی زۆر گرنگ ئەنجام دەدات ئەمەش بۆئێمە شتـێـکـی زۆر بـەسـودە لەبەرئەوەی دەستکاری کردنی بەرنامە بەهێزەکان فێربوونی یەکجار ناخۆشە بەسانایی لێی فێرنابین بۆیە ناچارین پەنا بـبـەیـن بـۆ بەرنامە ساناکان هەندێ جاریش بەرنامە سادەکان شتی وەکو بەرنامە بەهێزەکان دێنێتە ئاراوە بەلکو جوانتریـش بـەپـێـی تـوانـای بەرنامەکە بۆنمونە ئەم بەرنامەی من ئێستا باسی دەکەم زۆرشتی نایابی پێدەکرێت لەبواری وێنەدا بەرنامـەی Media Resizer PRO توانای گۆرینی چوارچێوەکانی وێنەی هەیە بەشێوەیەکی جوان چۆنیەتی کارکردن لەسەر ئەوبـەرنـامـەیـە . سـەرەتـا پـاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەر ئینجا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان لەخوارەوەی بەرنامەکە Add File هەیە یەکجـار بەماوس کلیکی لەسەر دەکەین دەبینین لیستی ماردەکان دەبێتەوە وێنە ١




وێنە ژمارە ( ١ )

پاشان هەروێنەیەکمان بوێت بۆدەستکاری ئۆپنی ناوبەرنامەکەی دەکەین لەرێگای ئەم لیستە وێنــە٢




وێنە
ژمارە ( ٢ )

پاشان سەیری وێنەکە بکە لەناو بەرنامەکە راستەو خۆ چوارچێوەیەکی زۆر جوانی بە وێنەکە بەخشیوە بـەلام گـەر بمانـەوێ ئـەم چوارچێوە لابەین کێکی تر بێنینە جێگای ئەوە سەیری لای راستی بەرنامەکە بکە لەسەرەوە Change Style هەیە یەك کلیـکـی لەسەر بکە ئەم لیستە دەبێتەوە وێنە٣




وێنە
ژمارە ( ٣ )

لەم چوار چێوانە کامیانت بەدڵبێ یەکجار کلیکی لەسەر دەکەیت راستەو خۆ وێنەکەت ئەم چوار چێوانە وەردەگرێت هەروەها هەر لەم لیستە لەسەرەوە لەلای راست Masks هەیە کلیکی لەسەر بکە جۆرێکی تر لەچوار چێوە دەکەوێتە بەرچاو وێنە ٤



وێنە
ژمارە ( ٤ )

هەروەها لەلای راست لەژێرەوە بۆشاییەك هەیە لەتەنیشت بۆشاییەکە Browse هەیە ئەویان بۆهەڵگرتنی وێنەکەتە لەکام هاردت بوێ هەروەها لەژێر ئەوەش هێمای پلەی کراوە ئەوەیان بۆ ریندەرکردنی وێنەکەتە یەکجار کلیکی لەسەردەکەیت چاوەڕێدەکەیت تا تەواو دەبێت وێنە ٥



وێنە
ژمارە ( ٥ )

# زنجیرەی (١) لە
# بەرنامەی (Inter Video Win Producer 3)
# چۆنیەتی درووست کردنی ((THEME)) ی DVD

ئامادەکار: دەوەن مەسعود عزالدین
DAWAN1985@YAHOO.COM

باشترین و بەهیزترین و ئاسانترین بەرنامە بۆ ئەوانەی ئارەزووی بەرنامەکانی مۆنتاج و میکسەر دەکەن دەتوانن لەرێگەی ئەم بەرنامە یەوە زیاتر لەپێویستیە کانی خۆیان سوود بەخشبن ئاسانترین رێگا بۆ فێربوونی :

سەرەتا لای ڕاستی بەرنامەکە دەچینە بەشی **AUTHORING** لەوێدا وێنەیەك رادەکێشین بۆ ئەنجام دانی کارەکە سەرنجی وێنەی ژمارە (١) بدە .




وێنە
ژمارە (١)

لەوێدا وێنەیەك رادەکێشێن بۆ ئەنجام دانی کارەکە سەرنجی وێنەی ژمارە (١) بدە .لەوێدا بە کلیك هەڵنەگرتن لەسەر وێنەکە ڕاکێشانی بۆ ناو پارچە شین کراوەکە دواتر کلیکی ڕاست دەکەین لەسەر لە بەشی ((THEME EDITOR)) ئەم پەنجەرەیەمان بۆ دەبێتەوە سەرنجی وێنەی ژمارە ((٢))بدە




وێنە
ژمارە (٢)




لەوێدا دەسکاری تیادەکەین ((OUTPUT TARGETS)) بۆ ((save)) کردن بەکاردێت لیرەدا دەبێتە سێ بەشەوە وەکو

A:((TO HARD DISC)) بۆ خەزن کردن لەناو بەشە هاردەکەت دیسان سێ ڕێگە دێتە پێشەوە

یەکەم :((VIDEO FILE)) بەکاردێت بۆ دروست کردنی ئەم تایپانە ((MPG *AVI *MPEG4)).

دووەم :((CD Content))بەکاردێت بۆ دروست کردنی تایپی ((VCD)). ئەم جۆرە لە ئامێری ڤیدیۆ سی دی یش کاردەکات.

سێیەم :((DVD Content))بەکاردێت بۆ دروست کردنی تایپی ((DVD)).

ئەم جۆرە لە ئامێری دی ڤی دی یش کاردەکات.

ئاگاداربە لەکاتی ((SAVE))کردندا دەبێت ناوێکی بۆ دابنێین ئەگەرنا لەکاتی پارچە مونتاژ کراوی دووەم پارچەکەی یەکەم وندەکەیت !!!

B :((TO BURN DEVICE)) ئەگەر ((CD & DVD . WRITER)) مان هەبوو ئەوا لەم بەشە دا را ستەوخۆ دەتوانین ((COPY))بکەیت بۆسەر ((DVD))و((CD))بە ئارەزووی خۆمان.

C :((TO DVD DEVICE))بۆ کامێرایی ((DVD))بەکاردێت سەرنجی وێنەی ژمارە ((٣)) بدە .




وێنە ژمارە ( ٣ )

وە ئەگەر بمانەوێت فایلی مونتاژەکەمان لەدەس نەچێت ئەوا جاری یەکەم ((SAVE US))دەکەین دوای پێنج خوولەك جارێ ((SAVE)) بکەین بۆ ئەوەی لەکاتی کارەبا بریندا رەنج بەخەسار نەبین بەهیوای سوود بەخش بێ بۆ هەموان

# بەشـــی ((Layer)) لە بەرنـــامەی ((Photo Shop))
# جوان کردنی تایتڵ

ئامادەکار: دابان عدنان سالــە یی
DABAN_ADNAN@YAHOO.COM

بێگومان هەمومان ئەوە دەزانین کە بەرنامەی ((photo shop)) یەکێکە لە هەرە بەرنامە بەهێزەکانی جیهان لەبەرئەوە پێم باشبوو کە باسی بە شێك لە بەرنامەی ((photo shop))بکەم لە بەشی ((layer)): بەرێزان ئەگەر هاتوو وێنەیەکمان هەبوو ویستمان ناوێك یاخود تایتڵێك لە سەری بنووسین ئەوا فۆتۆشۆپ جوانکاری ئێجگار زۆری بۆمان تەرخان کردووە فەرموون لەگەڵ مانبن بۆ فێربوونی:



یەکەم جار بەرنامەکە دەکەینەوەو دەچینە سەر لیستی ((file)) و((open)) دادەگرین یاخود دەبڵ کلیك لەسەر ((back ground))دەکەین و لیستێکمان بۆ دەبێتەوەو لەوێوە دەچیتە ناو ئەو فۆڵدەرەی کە وێنەکەتی تێدایە وەك وێنە ( ١ ) .

وێنە
ژمارە ( ١ )



دوای ئەوە پیتی (t)دادەگرین لە سەر (Key board) وکلیك لەسەر ( back ground)دەکەین دوای ئەوە چ ناوێکت بوێت دەینوسیت دوای ئەوە دەچیتە سەر لیستی (Layer) و(layer style)دادەگریت و (Blending options) ئینجا لیستەکەمان بۆ دەبێتەوە وەك وێنەی ژمارە (٢)

وێنە
ژمارە ( ٢ )

ئینجا لە لیستە کە هەر شێوەیەك هەڵبژێریت بۆ کالکردنی نوسینەکەت یان سێبەری هەبێت یان بە زۆر شێوە دەتوانیت نوسینەکەتی پێ برازێنیتەوە وەك وێنەی ژمارە (٣) وە دوای ئەوە خەزنی دەکەیت بە شێوەی ((JPEG)).




وێنە ژمارە ( ٣ )

ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە .

هەرێمی کوردستانی عێراق / ناو بازار بەرامبەر دەرگای قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شوێنی مەڵبەندی کۆمپیوتەر ئاراس یان بە ژمارە تەلەفۆنی ئاریا فۆن ٢٥٢٧٠٥٤ یان مۆبایلی کۆرەك ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان بە هۆی پۆستی ئەلکترۆنی

Email aras_co_center@yahoo.com : یان computer_magazine_2005@yahoo.com

# زنجیرەی ( ٨ ) لە بەرنامەی ADOBE PREMIERE

## کاریگەری گواستنەوەی نێوان پارچەکان

ئا: فەیسەل گەردی

١ـ بۆ زیاد کردنی کاریگەریەکان لە نێوان دیمەنەکان ئـەم هەنگاوانە دەگرینە بەر:

سەرەتا دەبێ دڵنیا بین کەوا هێڵی دەستکاری لە چـرکەی (٨,٠٥)رادەوەستێ، چونکە خاڵی یەك گەیشتنی هـەردوو دیمەنی دووەم و سێیەم لەم خاڵەیە کە دەمانەوێ کاریگـەری زیاد بکەینە سەری . (وێنەی١).




وێنە
ژمارە ( ١ )

٢ـ هەڵدەستین بە گۆڕینی شێوازی دەستکاری تاوەکو بتوانین بە شێوەیەکی باشتر و وورد تر کرداری کاریگەری گواستنەوە زیاد بکەین، لـــە پـــەنجـــەرەی Timelineتـیـشـکـە بچوکەکەی لە گۆشەی لای راستی سەرەوەی پەنجەرەکە کلیك دەکەین تا لیـستی هەڵبژاردەکانی پەنجەرەکـە Timeline window menu بـکـرێـتـەوە و شێوازی دەستکاری دەستی A/B Editing هەڵدەبژێرین . (وێنەی٢).




وێنە ژمارە ( ٢ )



وێنە ژمارە ( ٣ )

٣ـ پاش جێبەجێ کردنی فەرمـانـی پـێـشـوو پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە هۆشدارێمان دەکـات کەوا گۆڕینی شێوازی نمایش کردن لـەوانـەیـە دووچاری هەڵەبین ،گوێ بەم هۆشدارییـە مـەدە Yesکلیك کە. پاش ئەوە دەبینین کـە چـیـنـی دەستکاری جیا لە ژێر ناویVideo1Bوەنـاوی چینەکـەی سـەرەوە بـۆVideo1Aدەگـۆڕێ بجووڵێنین و هەروەها دەتوانین هەردوو بابەتـەکـە بناخنینە هەمان ڕووبەری زەمەنی بـێ ئـەوەی بەربەست بۆ ئەم کردارە ڕوویدات .(وێنەی٣).

٤ـ وەك ئامادە کاریەك بۆ زیاد کردنی کاریگەری گواستنەوەی نێوان هەردوو دیمەنی دووەم و سێیەم، پێویستیمان بە هێنانە کـایـەی چوونە نێو کاتی نێوان چرکەی کۆتایی لە دیمەنی دووەم Cyclers.١A لە چینی ڤیدیۆ Video١B و چرکەی سـەرەتـای دیـمـەنـی سێیەمFastslow. Avi لە چینی ڤیدیۆ Video١Aوە نیشانەی گواستنەوە لە چرکەی دووەمی بە یەك گەیشتن دادەنێین.
ئەگەر دیمەنی دووەم هێشتا لە چینی ڤیدیۆی Video1Aبوو ئەوا دەیگوازینەوە بۆ چینی ڤیدیۆی Video1B نیشانەی هـێـڵـی دەستکاری دەبینە نێوان خاڵی بەیەك گەیشتنی نێوان دیمەنی دووەم و سێیەم ، دیمنکە هەڵدەبژێرین و ڕایدەکێشینە چینی خوارەوە لە هەمان ڕووبەری کـاتـی، کـارا(تـفـعـیـل)کـردنـی فەرمانی ڕاکێشان بـەرەو لـێـوارەکـان Toggle Snap to Edges کردارەکـەمـان کـرداری گواستنـەوە بـۆشـوێـنـە نوێیەکە بەشـێـوەیـەکـی ڕاست و دروست ئـەنجـام دەدات وە لە لێواری هێڵی دەستکاری هـەروەك لـە وێنەی (٤) دا دیارە.



وێنە ژمارە ( ٤ )

٥ـ سەبارەت بە دیمەنی دووەم هەڵسانین بە هەموار (تعدیل) کردنی شوێنی پارچەی کۆتایی تاوەکو دیمەنەکە لە چرکەی (٨,٠٥) کۆتایی پێ بێت، ئەوەی ئێستا ئەنجامی دەدەین بریتی یە لە گواستنەوە پارچەی یەکەم لە دیمەنی سێیەم بۆ چرکەی (٧٠٥) بۆ ئەوەی هەردوو دیمەن لە یەك چرکە بگەنە یەك ، بۆ ئەنجامدنی ئەم کارەش بە شێوەیەکی وورد. لە ڕێگای پەنجەرەی Monitorبەشی بینینprogramکارەکە ئەنجام دەدەین ، بۆ گواستنەوەی هێڵی دەستکاری Edit Line بۆ چرکەی( ٧,٠٥)خانەکانی چرکەکان بە هۆی ماوس دیاری دەکەین لە خانەیProgram Locationو ڕەنگی دەکەین ۆ سەلماندنی دیاری کردنەکە هەروەها هەڵدەستین بە گۆڕین و نووسینی ژمارە (٨) بۆ (٧) . (وێنەی ٥).



وێنە ژمارە ( ٥ )

٦ـ یەکسەر نیشانەی هێڵی دەستکاری Edit Line دەچێتە سەر چرکەی (٧,٠٥)( وێنەی ٦).



وێنە ژمارە ( ٦ )

٧ـ ئامرازی هەڵبژاردن track select tool لە تابلۆی ئامرازەکانی Selection Toolیا بەردەوام (M)لە کیبۆرد دادەگرین٠ (وێنەی٧).



وێنە ژمارە ( ٧ )




٨ـ بابەتی سیّ یەم هەڵدەبژێرین (بابەتی چوارەم تۆتۆ دەکرێتەوە) وە رای دەکێشین بۆ هێڵی دەستکاری بە شێوەیەك شوێنی پارچەی یەكەم لە دیمەنی سێیەمFastsslow.av لە چرکەی (٧,٠٥) بێت. وێنە ( ٨ )

وێنە ژمارە ( ٨ )




٩ـ ئێستا دەتوانی کاریگەری گواستنەوەی پێوانەیی زیاد بکەین ئەوەیش بە کلیك کردنی دوگمەی Add Default Transition لە پەنجەرەی program ، یابە کلیك کردنی هەردوو دوگمەی (Ctrl+D).(وێنەی٩).

وێنە ژمارە ( ٩ )

کلیك کردنی دوگمەی Add Default Transitionکاریگەری گواستنەوە Crossزیاد دەکەینە نێوان هەردوو دیمەن لە میانەی پەنجەرەی Transition هەروەها دەتوانی جگە لە کاریگەرییCross Dissolve کاریگەری تریش هەن دەتوانین تاقیان بکەینەوە ، وە لەم حاڵەتەدا دەتوانین فەرمانی نمایشی جوولاو Animate کاری پێ بکەین . (وێنەی ١٠)




دوای هەڵبژاردنی ئەو کاریگەرییەی دەمانەوێ بەکار بهێنین هەڵدەستین بە دیاری کردن و راکێشانانی لە پەنجەرەی Transition و دایدەبەزێنین،ینە خاڵی بە یەك گەیشتنی ( دەمانەوێ کاریگەری زیاد بکەین) لە پەنجەرەی دەستکاری Time lineکە لێرەدا بابەتەکەمان خاڵی بەك گەیشتنی نێوان هەردوو دیمەنی (دووەم و سێیەم )ە ، کاریگەریەك بە شێوەیەکی تۆتۆ ئەو رووبەرە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە نێوان هەردوو دیمەن . (وێنەی ١١).

وێنە ژمارە ( ١٠ )

# بەرنامەی 3D Album
## بۆ دروست کردنی ئەلبومی ئەلکترۆنی

ئا: سەروین عبد الله

ئەم بەرنامەیە بەیەکێك لە گرنگترین بەرنامەکانی ڕێکخستنی وێنە دادەنرێت تائێستا ئەم بەرنامەیە وێنەی نیە لەجیهان وەك ماڵپەرە عەرەبیەکان باسی لێدەکەن بەرنامەیەکی یەکجار بەهێزە بۆدروست کردنی ئەلبوم بە ڕێکخستنی کۆمەڵێك وێنە دەتوانێت بە جۆرە ستایلێکی نوێ و جوان وێنەکان برازێنێتەوە وێنەکان هەموی دەخاتە ناو یەك ئەلبوم زۆربەجوانی پەر بە پەر هەلدەدرێتەوە بەشێوەی ڤیدیۆیی ئەم ئەلبومەش خۆت هەڵی دەبژێریت لەناو کۆمەڵێك ئەلبوم هەریەکەو جوانی خۆی هەیە هەروەها دەنێگێکیش بە دلی خۆت بۆ وێنەکان دادەنێیت سەیری بەرنامەکە بکە وێنە ١



وێنە ژمارە ( ١ )

سەیری لای ڕاستی بەرنامەکە بکە چەند وێنەیەك ریزبوون تۆدەتوانی لەشوێنی ئەم وێنانە وێنی خۆت بێنیتە ناوبەرنامەکە هەروەها سەیری ناوەراستی بەرنامەکە بکە شاشەیەك هەیە بۆنیشاندانی وێنەکانە هەروەها سەیری لای دەستەچەپی بەرنامەکە بکە style هەیە کە بۆ نیشاندانی ئەلبومە جۆراوجۆرەکانە وێنە ٢



وێنە ژمارە ( ٢ )



هەروەها لەتەنیشت ئەوەش mexer هەیە ئەویش بۆدروست کردنی پەری ئەلبومەکەیە بەدڵی خۆت وێنە ٣

وێنە
ژمارە ( ٣ )



هەروەها لەسەرەوەی بەرنامەکە چەند نووسینێك هەیە نووسینی دوەم کە organiz ە کلیکی لەسەر بکە لیستێکی نوێ دەبێتەوە کە هاردەکانی تۆی نیشانداوە تۆهەروێنەیەکت بوێ لەکوێت داناوە تەنها ئەو فۆڵدەرە یەکجار کلیك دەکەیت وێنەکە راستەو خۆ دێتە ناو بەرنامەکە وێنە ٤

وێنە
ژمارە ( ٤ )



هەروەها نووسینی پێنجەم کە پاش تەواو بوونی کارەکانت پێویستیت پێی دەبی بۆخەزن کردنی کارەکانت ئەویش بریتیە لە Layoutسەیری هێما سوورەکان بکە شێوەی فلۆپی کراوە لەسەرەوە یەك کلیکی لەسەر دەکەیت لیستی هاردەکانت دەبێتەوە تۆش ناوێکی بۆدادەنێیت و ئینجا OK لێدەدەیت بۆ پاراستنی ئەلبومەکەت وێنە ٥

وێنە
ژمارە ( ٥ )

# بەرنامەی AUTOCAD

ئا : غەزالە یونس

لەم زنجیرەیەی ئە م جا رە دا باس لە چە ند ئایکۆنێکی تردا دە کە ین بە هیوای سود وەرگرتنتان وە هـیوا دارم سوود لـە هـە موو زنجیرە کانی رابردوو وە ربگرن و بو ئەوەی لەو بوارەدا زیاترو زیـــاتر بـــەرە و پێش بچـن. بە رێزانـم لـەم زنجـیرەی ئـەم جـارە شدا هـــەر لــە لیستی وێنـە کـردن دەبین بـــاس لـــە ئایکۆنـەکانی تـر دەکە ین .

١. Donut

ئەم ئایکۆنەش بۆ وێنە کردنی دوو بازنەی هاوچەق .واتە کـــە بانگی دە کەیـــن لـــە لیستی وێنە کردن سەرەتـــا لـــە شریتـــی زانیارییەکـــان داوای نیـــــوە تـــیرەی نــــاوەوە دەکـــــات بەم شێوەیەی خـــــوارەوە Specify inside diameter of donut <0.5000بۆ نموونە ئەگە رئێمە نیوە تیرەی ناوەوە (١٠) بدەینیٚ کە ئە میش بە ئـارە زووی خۆمـــانە ئـەوا لە شریتی زانیا رییە کان بـەم شێوەیـەی خوارەوە دەبێت Specify inside diameter of donut <0.5000>: 10 دوای ئە میش داوای نیوە تیرەی دەرەوە دەکات کە گەورە کەیە بۆنموونە ئەگەر (٢٠) بدەینیٚ بەم شێوەیەی خوارە وە :Specify outside diameter of donut <1.0000>
20دوای ئەوە داوای چەقـــی وێنەکە دەکـــات بەم شێوەیە Specify center of donut or <exit ئەو کات دەتوانیت بە ئارە زووی خۆت چەقەکەی دیاری بکەیت وەچە ندین دانەشی لیٚ درووست بکە ین .(وێنە ی ١)




وێنە
ژمارە ( ١ )

## ٢. spline

ئه‌مه‌ش فرمانێكه به‌كار دێت بۆ وێنه كردنی زۆر شێوه‌ی جیاجیا بۆ نموونه ئه‌گه‌ر بمانــــه وێت وێنـه‌ی Carve دروست بكه‌ین ئه‌وا به هۆی فرمانه سه‌ره تا خاڵی سه‌ره تای پێده‌دەین پاشان چه‌نــد خــاڵێكی پێـده ده‌ین بـۆ دروسـت كـردنی چه‌ماوه كه جا به‌پێی جۆری وێنه كه بۆ نموونه (وێنه ی ٢ ) چه‌ماوه و خاڵه كانمان بۆ ڕوون ده‌كاته وه .




وێنه ژماره ( ٢ )

## ٣. Point(خاڵ).

له كاتی وێنه كردندا زۆر جارپێویستیمان به‌وه ده‌بێت كه خاڵێك ده‌ست نیشان بكه‌ین بۆ سه‌ره تای هه‌ر وێنه یه‌كمان جا یان خاڵێك یان پێویسیمان به كۆمه‌ڵه خاڵێك ده‌بێت ئه‌م خاڵانه‌ش ده‌توانین ده‌ستكاری قه‌باره‌ی بكه‌ین هه‌روه‌ها شێوه‌ی خاڵه‌كه ش به ئاره‌زووی خۆمان ده‌ست نیشانی ده‌كه‌ین . جاسه‌ره تا ده‌چینه سه‌ر لیستی وێنه كردن پاشان ده‌چینه سه‌ر (Point)

پـاشـان ده بـێـتـه دووبه‌ش ئه‌میش تاك خاڵه (Singl Point) وه هه روه هـــا چه‌نـــد خاڵـــه (Multiple point) به‌پێی كاره كه‌مان یه‌كێكیان ده‌ست نیشان ده‌كه‌یـــن . (وێنه ی ٣).




وێنه
ژماره ( ٤ )

پاشان دەچینە سەر لیستی Formatوە دەست نیشان کردنی Point Style ( وێنەی ٤ )دوای ئەو پەنجەرەیەکت بۆ دێت کەدە توانیت بە ئارە زووی خۆ ت یەکێك لە خاڵەکان دەست نیشان بکەین پاشان لە ژێـــرەوەی پەنجەرەکە چوارگۆ شەیە کی بچوك هەیە ئەمیش بۆ گۆڕینی قە بارەی خاڵەکەیە ئەمیش بەئارەزووی خۆت دەستکاری دەکەیت . (وێنەی ٥). دوای دەست نیشان کردن و هەڵبژاردنی خاڵەکە لە سەر ڕووبەری بەرنامە دەتوانین لە هەر شوێنێکی پێویست بمانە وێت کلیك بکەین و خاڵ درووست بکە ین (وێنە ی ٦)



وێنە ژمارە ( ٦ )



وێنە ژمارە ( ٥ )



وێنە ژمارە ( ٨ )



وێنە ژمارە ( ٧ )

**سرینە وەی وێنەکارەکانمان:-

بەرێزانم هەرکاتێك ئێمە وێنەیەك دەکێشین لە لاپەرەیەکـی نوێـدا ئەوا بێگومـان پێویستیمـان بە سرینـەوەشـی دەبێت .جا لێرەدا فرمانێکمان هەیە بۆ سرینەوە بەکاری دەهێنین .سەرەتا کلیك لەسەر ئەو بەشە دەکەین کە دەمانەوێت بیسرینەوە بۆ نموونە ئەگەر وێنەی بازنە یەکمان هەبێت ئەوا کلیك لە سەر بازنەکە دەکەین (وێنەی٧ ) ئینجا لـە سـێ شوێن دە توانین بیسرینە وە :-

١. کلیك کردن لە سەر مەقەست لە شریتی Standard .

٢. Earsدەست نیشان دەکەین لە لیستی (Modify) وێنەی (٨).

٣. هەروەها لە شریتی کەرستەکان Ears دەست نیشان دەکەین .

# بەرنامەی Magic Utilties

ئا: شێرزاد مەولود

زۆرجار ئێمە کە بەرنامەیەك کارپێ دەکەین و سەیری دەکەین ئاسانکاریمان بۆدەکات بەشێوەیەك کە شیکردنەوەیەکی تەواومان بۆدەکات ئێمە لەوکاتەدا گرنگی ئەوبەرنامەیە دەکەوێتە بەرچاومان و دەبێ ئەوکاتە زیاتر گرنگی تەواو بەبەرنامەکە بدەین لە بەرئەوەی وەفاداریمان بنوێنین بەرامبەر ئەوکەسەی کەئەو کارە چاکەی ئەنجامداوە بۆیە من دەڵێم زانایانی بواری کۆمپیوتەر وەك ئەوە وان کە توێکڵی هێلکەیان پاك کردبێ و بۆئێمەیان رەوان کردبێ تا ئێمە بەسانی هێلکەکە بخۆین بەڵێ ئەگەر ئاسانکاری ئەوان نەبوایە ئێمە ئێستاش هەر بەدوای بەرنامـــەیەکی وەکو Magic Utilties و هەزاران بەرنامەی لەوە چاکتر وێڵدەبووین من هەر چەند لەم بوارەدا بدوێم بە بۆچوونی خۆم هێشتان پێم کەمە لەبەرئەوەی دۆزینەوەی رێگای ئاسان کاتری تەنها لەبواری بەرنامەکانی کۆمپیوتەرداهەیە خۆشەویستان بەرنامەی Magic Utilties بەرنامەیەکی زۆر بەهێزە لەبواری شیکردنەوە . چۆن ؟ ئێمە چەند بەرنامەمان لە سەرکۆمپیوتەرەکانمان دابەزاندوە لەوانەیە بەژمار نەیێت چونکە هەربەرنامەیەك تایبەتە بەکارێك بەڵام کۆنترۆڵکردنی هەموو بەرنامەکان لەلایەن بەرنامەی Magic Utilties کارێکی زۆر ئاسانە هەمووبەرنامەکان لەیەك کاتدا بۆت دیاری دەکات . وەك تۆ کام بەرنامەت پێویستە بۆ زانینی زانیاری لەسەری یان تۆ کام بەرنامەت ناوێ بۆ فرێدانی یان ئەو بەرنامەیە خێرایی چەندە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت یاخود چەندی لەرامەکەت بەکاردێنی هەر ئەوانەو چەند شتێکی تر بەیەکجار بۆت دیاری دەکات .چۆن دەتوانین کار لەسەر ئەو بەرنامەیە بکەین سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر ئامێری کۆمپیوتەرەکانمان ئینجا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە سەیری وێنـــــە ١ بکە.




وێنە ژمارە ( ١ )

بکە پاشان سەیری سەرەوەی بەرنامەکە بکە چەند شتێك نوسراوە کە هەرشتەو کارێکی تایبەت بەخۆی ئەنجام دەدات هەروەها لەناوەراست وێنەی هەموو بەرنامەکان کراوە ئەو بەرنامانەی تۆ داتبەزاندۆتە سەرکۆمپیوتەر هەوەها لە خوارەوەش چەند ئایکۆنێك هەیە کە ئەوانیش چەند کارێکی تایبەت بەخۆیان ئەنجام دەدەن ئێستا ئەگەر بێت وئایکۆنێك لەناوەراستی بەرنامەکە دیاری بکەین بەماوس پاشان بێین لەخوارەوە Program Info لێبدەین سەیر دەکەین زانیاری تەواومان دەداتێ سەبارەت بەو بەرنامەی دیاریمانکردبوو وێنـــــــە٢




وێنە
ژمارە ( ٢ )

هەروەها ئەگەر Delete Entry لێبدەین بەرنامەکە لەناو لیستی ستارت رەش دەبێتەوە هەروها ئەگـەر Unistal لـێـبـدەیـن بەرنامەکە لەناو تەواوی کۆمپیوتەردا نامێنێت هەوەها ئەگەر لەسەرەوەی بەرنامەکە Process Killer لـێـبـدەیـن سـەیـری دوگێچەکە بکە دیاری کردوە کە ئەوبەرنامەیە چەندی لەخێرایی کۆمپیوتەرەکەت داگیرکردوەو هەروەها چـەنـدیشی لـەرامـەکـەت داگیرکردوە ئەمەش زۆرگرنگە چونکە ئێمە نازانین ئەوبەرنامەیە چەندە لەناو رام و پرۆسیسەردا وێنـــــــە٣




وێنە
ژمارە ( ٣ )

# زنجیرە بەرنامەی Cool Edit Pro

ئا: کاوە سلێمان

لەم بەشەدا باس لە هێنانە پێشی دەنگ دەکەین واتا تۆ گۆرانیەکت هەیە مۆسیقاکەی زیاترە لەدەنگەکەی ئەوکاتە دەتوانی سود لەبەرنامەی Cool Edit Pro وەربگری یان بەپێچەوانەوە گۆرانیەکەت دەنگەکەی زیاترە لە مۆسیقاکەی دیسان لەم کاتەدا پێویستیت بەبەرنامەی Cool Edit Pro دەبێت بۆیە من دەڵێم تاشێستا بەرنامە نیە بگات بەم بەرنامەیە چۆن بەرنامەیەك دەتوانێت هەموو گۆرانکاریەك بەسەر دەنگ بێنیت بێکەم وکوڕی بەراستی وەك ئەجنەبی دەڵێن سوپەر بەڵێ ئەمەیە بەراستی شایانی خۆیەتی هەرچی پێبلێن لەبەرئەوەی من وا شەیدای ئەوبەرنامەم تائیستا کارنیە بۆمی نەکردبی لەبواری دەنگ هەرچیم ویستبی بۆمی جێ بەجێی کردوە بێکەم وو کوری ئەوجا جۆن عاشقی ئەوبەرنامە نەبم بەرێزان بەڵێن تان پێدەدەم لەم زوانە دەست دەکەم بەباسکردنی زنجیرە بەرنامەی( DJ) چۆن دیجەی دروست دەبێت بەدرێژی باسی لێوە دەکەین.. ئیستا ئێمە گۆرانیەکمان هەیە دەنگە کە کەمترە لەمۆسیقاکەی ئایا چۆن چاك دەبێت سەرەتا دێین بەرنامەی Cool Edit Pro دەکەینەوە پاشان گۆرانیەکە دێنینە ناو بەرنامەکە لەرێگای OPEN ەوە پاشان دێینە سەر نووسینەکانی سەروە کە Effects لەوێوەش Amplitude لوێوەش Channel Mexer هەڵدەبژێرین وێنە١




وێنە ١

پاشان لیستێك دەبێتەوە لەم لیستەدا LR to Mid-Side هەڵدەبژێرین لەتەنیشت ئەوەش چوار گێچ هەیە بەزیادکردن و کەم کردنی ئەم گێچانە هەست بە هێنانە پێشەوەی دەنگەکەو دوورخستنەوەی مۆسیقاکە دەکەین هەروەها هەر لەم لیستەشدا preview هەیە یەك کلیکی لەسەر بکە گۆرانیەکە گوێبیست دەبیت وێنە ٢ پاشان ok هەڵدەبژێرین پاشان Save As دەکەیت بۆ ئەوەی لە ناو بەشە هاردەکەت خەزنی بکەیت دواتر دەتوانن بۆ گوێ گرتن لە گۆرانیەکە دوای ئەوەی دەست کاریمان کرد لەو جێگایەی کە پاراستومانە بیکەینەوە وببینین کە چ گۆرانکاریەکی بەسەر داهاتووە ئینجا ئەگەر بانەوێت دەتوانین ئەوکردارە بۆ ئەو گۆرانیانە بەم شێوەیەی بکەین کە دەنگیان لە مۆسیقا بەرزترە یان مۆسیقا لە دەنگ بەرزترە.




وێنە ٢

# بەرنامەی Full Video Converter

ئا: هاودەم احمد

بەرنامەیەکی بەهێزە و توانای گۆرینی بۆچوارجۆری ڤیدیۆیی وەکو MPEG, AVI, WMV Real Media هەیە هەروەها توانای گۆرینی ڤیدیۆی هەیە بۆ وێنەی وەکو BMP JPG, PNG, GIF هەروەها دەتوانێ ڤیدیۆ راستەو خۆبگۆرێت بۆدەنگ جۆری MP3, WAVE, OGG, WMA هەروەها توانای چەند ڤیدیۆیەك بەیەکەوە گۆرین و هەروەها کۆمەڵێك دەنگ بەیەکەوە هەیە بەم جۆرە ناوی لەخۆی ناوە Full Video Converter بەراستی ناوەکە شایانی خۆیەتی لەبەر ئەوەی بەرنامەیەك ئەوهەموو کارەبکات من پێی دەڵێم نایاب خۆشەویستان وەك دەزانن هەموو گۆرینێك پێویستی بەبەرنامەیەك هەیە کەم بەرنامە هەیە لەکارێك زیاتر ئەنجام بدات بەلام بەرنامەی Full Video Converter زیاتر لە ١٥ جۆر کار ئەنجام دەدات بەراستی شتێکی بەسودە بەتایبەتی ئەوانەی خولیای بەرنامە کۆنڤێرتەکانن کارکردن لەسەر ئەوبەرنامەیە زۆر گران نیە کە نەزانرێت کاری پێبکەیت بۆنمونە ئەگەربێت و بەرنامەکە دابەزێنین لەسەرکۆمپیوتەر پاشان بێین بەرنامەکە بکەینەوە دەبینین لەلای چەپ لەسەرەوە بۆشایەك هەیە هەروەها لەلای راست لەخوارەوە شاشەیەك هەیە هەروەها لەلای چەپ لەخوارەوە چەند نوسینێك هەیە بۆشایی سەرەوە هێنانە ژوورەوەی ڤیدیۆیە بۆناو بەرنامەکە وێنە١



وێنە ( ١ )

پاشان ئەوڤیدیۆیانەی کەهاتینە ناو بەرنامەکە یەکێکیان رادەکێشیت بۆناو شاشەکەی خوارەوە وێنە ٢



وێنە ( ٢ )

پاشان لەناوەراست لەلای چەپ real, media, wmv, avi, mpeg هەیە و هەریەك لەوانە هێمای راستێ لەتەنیشتیان دراوە هەر کامەیانت بوێت هێماکەی دادەگریت وێنە ٣




وێنە ( ٣ )

پاشان لەلای چەپ ToAudio هەیە واتا ڤیدیۆکە دەگۆرێت بۆ دەنگ هەمان کردار دوبارە دەکەیتەوە هەر وەها لەژێرنەوە To Imaege هەیە واتا ڤیدیۆ بۆرسم هەمان کرداری سەرەتا دوبارە دەکەیتەوە ئینجا بۆشایەك هەیە لەخوارەوە بۆدیاری کردنی هاردەکەیە کە پارچە ڤیدیۆکەی دەچێتە ناو وێنە ٤ ئینجا Convert هەیە لەخوارەوە یەکجار بەماوس کلیکێك لەسەری بکە پاشان چاوەروان بە تا ریندەرەکە تەواو دەبێت بەم شێوەیە کرداری گۆران پەیدادەبێت




وێنە ( ٤ )

# زنجیرە (٨) بەرنامەی فلاش MX

## دەنگ لە فلاش

ئا: فەیسەڵ مەعروف

دەنگ یا مۆسیقا لە بەرنامەی فلاشدا جوانی دەبەخشێتە کارەکانمان لە فلاش ، بۆیە دەنگ لە پێکهاتە گرنگەکانی ئەم بەرنامەیە لە کاتی دیزاینی کارەکانی وەك یاری یا دوگمە لە فلاش.

بەرنامەی فلاش دوو جۆری فایلی دەنگی قبوڵ دەکات کە بریتین لە هەردوو جۆری (MP٣, Wav).

دوای هێنانی فایلی دەنگی پێویستە بە کار بهێنرێت یاجێبەجێ بکرێت لە :

١) لە سەر هەمان چین .

٢) جێ بەجێ کردنی لە رێگای زمانی کۆنترۆل ناسراو بە Action Script.

**چۆنیەتی بەکار هێنانی دەنگ**

١.فایلی دەنگی دەهێنین لە رێگای فەرمانی Importلە لیستی File. (وێنەی ١).




وێنە ( ١ )

.پاش هێنانی فایلی دەنگیەکە ، (٥) چوار چێوەمان دروستکرد و داماپۆشی ئەویش لە رێگای یەکجار کلیك کردنی چەپە و پاشان دەچینە سەر شاشەی تایبەتمەندی و لە لیستی دەنگ Sound ئەو دەنگە هەڵدەبژێرین کە هێناومانەتە نێو بەرنامەی فلاش ، سەیر دەکەین کە لە سەر چینە کە دروست بووەوە کاتێ ئەم کارە ئەنجام دەدەین دەبینین دەنگەکە چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە بێ وەستان.

**کاریگەریەکانی ( Effect) دەنگ:**

دەنگ چەند گاریگەریەکی هەیە بریتین لە:

١.دەرچوونی دەنگ لە بڵند گۆی چەپە Left Channel

٢.دەرچوونی دەنگ لە بڵند گۆی راستە Right Channel

٣.دەرچوونی دەنگ بە هێز لە بڵند گۆی چەپە ونزم بوونی پلە بە پلە لە بڵند گۆی راستەFade Left to Right.

٤. دەرچوونی دەنگ بە هێز لە بڵند گۆی راستە ونزم بوونی پلە بە پلە لە بڵند گۆی چەپە Fade Right to Left.




٥.دەرچوونی دەنگ بەهێز و نرم بوونی پلە بە پلە لە هەر دوو بڵند گۆ Fade In.

٦.دەرچوونی دەنگ بە نرمی و زیاد بوونی پلە بە پلە Fade out.

٧.رێکخستنی دەنگ بە ئارەزووی خۆمان لە رێگای فەرمانی Custom. (وێنەی٢)

وێنە ( ٢ )

فەرمانی Custom

دوای هەڵبژاردنی فەرمانی Custom پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە کە ئەم تایبەتمەندیانەی لە خۆ دەگرێت:

١)بڵند گۆی دەنگی راستە بەشی سەرەوەی پەنجەرەکە دەنگی بەرنامەکە لە خۆ دەگرێ.

٢)بڵند گۆی دەنگی چەپە بەشی خوارەوەی پەنجەرەکە هەمان دەنگی بەرنامەکە لە خۆ دەگرێ.

٣)درێژی دەنگەکە ئەو شریتەیە لەناوەراستی پەنجەرەکەیەو ئەوەی تیادا دیارە کەدەنگەکە چەند چرکە دەخایەنێ.

٤) کاریگەری لە سەر دەنگەکە دەست پێ دەکات لەو شوێنەی کە نیشانەی کۆنترۆل هەیە کە دەکەوێتە لای چەپەی شریتەکەی ناوەراست.

٥)ماوەی کاتی دەنگەکە کورت و درێژی بکەینەوە . (وێنەی٣).




وێنە ( ٣ )




وێنە ( ٤ )

بۆ زیاتر روونکردنەوە هەڵدەستین بە دانانی کاریگەری دەنگـــی لە سەر چرکەی یەکــــەم ، درێژی دەنگە کە بریتـــی لـــــە (١,١٣)چرکە،هەروەك گوتمان دەتوانین دەنگە کورت و درێژ بکەینەوە بە هۆی چوار گۆشەی رێکخستن لە لای راستە لــــە (١,٣) لە چرکە، لە سەرەوەی پەنجەرەکە لە بڵند گۆی راستە چوار گۆشەیەکی سپی دەبینین ، ئەم چوار گۆشەیە توندی دەنگەکەلە بڵند گۆی راستە رێك دەخات هەروەهابە هەمان شێوەش سەبارەت بە بڵند گۆی چەپە . (وێنەی ٤).

چۆنیەتی کۆنترۆل کردنی دەنگ:

دەتوانین چەند چوار گۆشەیەك لەسەر هەر یەك لەبڵند گۆیەکان دروست بکەین ، بەکلیك کردن لە سەر هێڵە رەشە باریکەکە.

بڵندگۆی راستە(شاشەی سەرەوە)

ئەو چوار گۆشانەی دەکەونە ژێرەوەی ئاوازی دەنگەکە ئەوە دەگەیەنێ کە دەنگەکە کز و هێواشە بەلام ئەو چوار گۆشانەی دەکەونە سەرەوەی ئاوزای دەنگەکە ئەوە دەگەیەنێ کە دەنگەکە بە هێز وتیژە ، کەواتە شاشەی سەرەوە یابڵند گۆی راستە بە هێواشی و کزی بە نیو چرکە دەست پێ دەکات و دواتر بەرز دەبێتەوە ئەمەش Fade out ە.

بڵند گۆی چەپە(شاشەی خوارەوە)

دەنگەکە بە هێز دەست پێ دەکات و دوای کپ دەبێ FadeIn. لە هەر دوو شاشە بەم شێوەیە دەبێت :

لە بڵند گۆی راستە دەنگەکە بە کزی دەست پێ دەکات و بە توندی و بەرزی کۆتایی پێ دێت، وە لە بڵند گۆی چەپە بە دەنگـی بە هێـز دەست پێ دەکات و بەرە بەرە کز دەبێـت Fade in Fade out Right Channel Fad in Left Channel.




وێنە ( ٥ )

ڕووداوە دەنگیەکان Event: لە فلاش سێ جۆرن و بریتین لە :

١)Start: یەکجار دەست پێ دەکات و دووبارە دەبێتەوە کاتێ جێ کردنی شانۆ Loopجارێکی تر دەست پێ دەکاتەوە ، کەواتە دەنگەکە دووبارە دەبێتەوە بە دووبارە بوونەوەی شانۆی کار لە کاتی جێ بە جێ کردن وە هۆی دووبارە بوونەوەش بریتی فەرمانی دووبارە بوونەوە Loopیا دەنگە دووبارە دەبێتەوە کاتی ئەم فەرمانە کارا بکرێ. (وێنەی ٦ و ٧).

٢)Stop:وەستاندنی دەنگ و بە هیچ شێوەیەك كار ناكات.

٣) Stream:دەنگەکە جێ بە جێ دەکرێت بە گوێرەی درێژی لە سەر چینەکان گەر دەنگەکە (٢٠)چوار چێوە دابپۆشێ ئەوا لە ماوەی (٢٠) چوار چێوە کاردەکات.



وێنە ( ٦ )



وێنە ( ٧ )

# بەرنامەیەکی گرنگ و پێشکەوتوو

# Ace opimizer utilites

## زنجیرەی چوارەم کۆتایی

بێستون عمر

بەشی چوارەم بریتیە لە Miscellaneous کە بریتیە لە سێ خزمەت گوزاری یەکەمیان بریتیە لە دۆزینەوەی فۆڵدەری بە تاڵ لە ناو کۆمپیوتەر (Find Empty Foldrs) لەدوای کردنەوەی بەرنامەکە ئینجا کلیك کردن لەسەر Miscellaneous بەمەش سێ خزمەت گوزاریەکە دەردەکەون ئێمە بۆ ئەوەی بەدوای فۆڵدەرە بەتاڵەکان بگەرێین کلیك لەسەر (Find Empty Foldrs) دەکەین بروانە وێنەی (١)




وێنە ژمارە ( ١ )

پاشان بۆکسێك دەکرێتەوە بروانە وێنەی (٢)




وێنە ژمارە ( ٢ )



ئینجا بۆ ئەوەی بەناو کۆمپیوتەردا بگەڕێت کلیك لەسەر (Scan) دەکەین وەك لەوێنەی (٢) دیارە پاشان کۆمپیوتەر دەست بەگەران دەکات لەماوەیەکی کەم تەواوی فۆڵدەرە بەتاڵەکان دەدۆزێتەوە بروانە وێنەی (٣) ئینجا گەر ئێمە مەبەستمان بێت ئەوا وەك لە وێنەی (٢) دیارە هەموو ئەو فۆڵدەران دەسرینەوە .

وێنە ژمارە ( ٣ )

خزمەت گوزاری دووەم بریتەیە لە شیکارکردن بۆ کۆمپیوتەرو بۆ فۆڵدەرکان بۆ نمونە قەبارەی قورسی (C) چەندە وە چەندی داگیرکردوەو چەندی بەبۆشی ماوەتەوە وە هەر فۆڵدەرێکی چەند فایل و چەند فۆڵدەری تێدایەوە وە قەبارەیان چەندی وە جۆری فایلەکان چیە بۆ ئەم مەبەستەش ، لەدوای کلیك کردن لەسەر (Disk Analysis) وەك لەوێنەی (١) دیارە راستەوخۆ شیکاری بۆ قورسەکانی کۆمپیوتەر دەکات لەڕوی قەبارەوە بروانە وێنەی (٤)




وێنە ژمارە ( ٤ )

پاشان ئێمە دێن بە ئارەزوی خۆمان شیکاری بۆ هەر فۆلدەرێك یان قورسێك دەكەین لەم شیكاریەدا قەبارەی فۆلدەرەكان یان فایلەكان لەزۆرترینیان تاكەمترینیان ریز دەكات پاشان ژمارەی فایلەكان و چەند فۆلدەری تری تێدایە وفایلەكان لەسەر چ شێوەیەك یان بە چ فۆرماتێك خەزن كراون وە ئەم فۆرماتانە هەریەكە بەرێژەی سەدا چەند شوێن داگیر دەكەن لەناو كۆمپیوتەر . ئەم بەشە تەنها لەكاتی بەكارهێنانی دا سودەكانی رونتر دەبنەوە بەلاَم یەكێكە لە گرنگترین بەشەكانی ئەم بەرنامەیە چونكە دەتوانیت لە ژمارەو قەبارەی هەموو جۆرە فایلەكانی ناو كۆمپیوتەرەكەت بگەیت .

بەشی سێیەم بریتیە لەدانانی كات بۆ جێبەجێكردی رەش كردنەوەی فایلە بێسودو ئەو فایلانەی لەئەنجامی كاركردن دروست دەبن لە زنجیرەكانی تری ئەم بەرنامە باسمان كردووە بەلاَم مەبەست لە دانانی كات واتە هەموو كاتێك یان دوو رۆژ جارێك یان تەنها هەفتانە یان كاتێك بە ئارەزوی خۆت دیاری دەكەیت بۆ ئەم كردارە لە دوای كردنەوەی بەرنامەكە بۆكسێك دێت بروانەی وێنەی (٥) دوای دەست نیشان كردنی سرینەوەی فایلەكان ئەوا لەبەشی خوارەوەدا دێن دەست نیشانی كاتەكە دەكەین بۆ نمونە من بۆ خۆم هەموو هەفتەیەك كاتژمێر سێ رۆژانی هەینی ئەم فایلانەم بۆ رەش بكاتەوە بروانە وێنەی (٥) بەمەش هەموو هەفتەیەك جارێك كۆمپیوتەر لەم فایلە بێ سودانە پاك دەبێتەوە پاش دانانی ئەم كردارانەش كلیك لەسەر (Set Schedule) بۆ كسێك دێت راستەوخۆ (OK) دەكەین پاشان بۆ كسێكی تردێت بروانە وێنەی (٦) ئەگەر مەبەستمان نەبێت هیچ گۆرانێك بكەین ئەوا راستەوخۆ ( Ok) دەكەین بەمەش كردارەكە كۆتایی دێت .




وێنە ژمارە ( ٥ )

# ٣٨ ڕێنمایی بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەر

## زنجیرەی شەشەم

شاخەوان عمر حسـن
shakhawano@yahoo.com

### ١٨. خێراکردنی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر

بەرنامەکانی ناو کۆمپیوتەر بەشێوەیەکی گشتی هەریەکەیان کاتێکی دیایکراویان هەیە بۆ کردنەوەیان بۆ نمونە کاتی کردنەوەی بەرنامەی فۆتۆشۆپ زیاتر دەخایەنێت لە کردنەوەی بەرنامەی وۆرد یان هەربەرنامەیەکی تری سادە بێت ، کاتی کردنەوەی بەرنامەکانیش بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ کاریگەری دەبێت لەسەر خێرایی کۆمپیوتەر بۆ ئەوەی ئێمەش بە ڕێگایەکی زۆر ئاسان بتوانین کاتی کردنەوەی بەرنامەکان کەم بکەینەوە وتا بەکورترین ماوە بتوانین بەرنامەیەك بکەینەوەو کاری پێبکەین ، بۆ ئەم مەبەستەش دەتوانین لە (Task Manager) ئاستی خێرایی کردنەوەی بەرنامەکان بگۆرین بە داگرتنی (CTRL+ALT+DEL) دەچینە سەر (Task Manager) پاشان کلیك لەسەر بەشی (Processes) دەکەین بروانە وێنەی (١)




| Image Name | User Name | CPU | Mem Usage |
|---|---|---|---|
| WINWORD.EXE | eruna company | 00 | 2,560 K |
| taskmgr.exe | eruna company | 03 | 4,468 K |
| rundll32.exe | eruna company | 00 | 2,940 K |
| DevDetect.exe | eruna company | 00 | 3,480 K |
| explorer.exe | eruna company | 00 | 12,768 K |
| mdm.exe | SYSTEM | 00 | 3,092 K |
| kavsvc.exe | SYSTEM | 02 | 12,052 K |
| btwdins.exe | SYSTEM | 00 | 2,972 K |
| alg.exe | LOCAL SERVICE | 00 | 4,096 K |
| BTSTAC~1.EXE | eruna company | 00 | 7,792 K |
| spoolsv.exe | SYSTEM | 00 | 6,856 K |
| svchost.exe | LOCAL SERVICE | 00 | 4,124 K |
| svchost.exe | NETWORK SERVICE | 00 | 3,556 K |
| svchost.exe | SYSTEM | 02 | 19,752 K |
| svchost.exe | SYSTEM | 00 | 4,672 K |
| lsass.exe | SYSTEM | 00 | 1,260 K |
| services.exe | SYSTEM | 00 | 3,496 K |
| winlogon.exe | SYSTEM | 00 | 476 K |
| csrss.exe | SYSTEM | 00 | 4,932 K |

وێنە
ژمارە ( ١ )

پاشان کامە بەرنامەمان مەبەستە کلیکی ڕاستی لەسەر دەکەین ئینجا دەچینە سەر (Set Priority) وەك لەوێنەی (٢)




وێنە ژمارە (٢)

دیارە لە بەشی (Set Priority) چەند هەڵبژاردەیەك هەن هەرکامیان هەڵبژێرین لە سەروی نۆرماڵەوە واتای خێرا کردنی بەرنامەکەیە تەنها (HIGH) نەبێت واتا بەرزترین بەڵام ئەوانی تر زۆر کرداری و زۆر باشن .

## ١٩ - نێرەری نامەی هەڵە بۆ مایکرۆسۆفت لە هەموو هەڵەیەك یان ڕودانی کارێکی ناسروشتی لە کاری ویندۆز یان ڕودانی هەڵەیەك لە سیستەم ئەوا بۆکسێك دێت داوای ناردنی ئەم هەڵە دەکات بۆ مایکرۆسۆفت .

بەمەش بەشێوەیەکی گشتی ئێمە ڕەت دەکەینەوە نامانەوێ نامەکە بچێت بۆ مایکرۆسۆفت بەمەش زۆربەی جاران ئەو بەرنامانەی کەکراونەتەوە لەگەڵ خۆیان دایان دەخات بەمەش دەبێتە هۆی لە دەست چونی زانیاریەکان ئەگەر بەرنامەی وۆرد بێت . یان دەبێتە هۆی بە فیرۆچونی ماندوبون و هەوڵ و هەنگاونان بۆ دروست کردنی یان دەست کاریکردنی وێنەیەك یان هەرکارێکی تربێت بەبێ خەزن کردن دایان دەخات لەهەمان کاتیشدا کاریگەری دەبێت لەسەر ئەداو خێرایی کۆمپیوتەر جا بۆ ئەوەی لەم بۆ کسە ڕزگاریمان بێت و لەکاتی ڕودانی هەر هەڵەیەك توشی ڕاوەستان و لەناو چونی زانیاریەکانمان نەکات پێویستە ئەم بۆکسە لەگەڵ ڕودانی هەر هەڵەیەك ڕابگرین لە ژمارەکانی پێشوی گۆڤاری کۆمپیوتەر باس کراوە .

## ٢٠ - خێرایی هەڵدانەوەی پەڕەکانی وێب

کۆمپیوتەر وەکو بەشێ لە کارپێکردنی بەرنامەکانی هەڵدانەوەی پەرەکانی وێب کاریگەری دەبێت لەسەر خێرایی کارکردن و خێرایی هەڵدانەوەی پەرەکانی وێب لەراستی دا هەر بەرنامەیەك لە رێگای کۆمپیوتەر کار بکات کاریگەری دەبێت لەسەر خێرایی و ئەدای کۆمپیوتەر بەهەمان شێوەش بەرنامەکانی تایبەت بە هەڵدانەوەی پەرەکانی وێب کاریگەریان هەیە ، جا بۆ ئەوەی لە ئەدای کۆمپیوتەر کەم نەبێتەوە پێویستە هەڵدانەوەی پەرەکانی وێب خێرا بکەین و ئەدایان باشتر بێت بۆ ئەم مەبەستەش پێویستمان بە چەند کردارێکە بۆ دروست کردنی فایلێك لە نۆت پاد و دواتر خستنە ناو سیستەم ئەم کردارەش لە ژمارە (٨) ی گۆڤاری کۆمپیوتەر لە لاپەرە (٥٤) باس کراوە .

## ٢١ - کـــاش

ئایا کۆمپیوتەرەکەت کاشی تەواوە یان نیو کاشە یان ربع کاشە هەریەکە بە قەبارەی خۆی کاریگەری دەبێت لەسەر خێرایی و ئەدای کۆمپیوتەر بۆ نمونە کاشی تەواو (فول کاش) باشترین و خێراترین ئەدای هەیە بەبەراورد لەگەڵ نیو کاش .

## ٢٢ - پنتیـــۆم

کۆمپیوتەرەکەت پنتیۆم بێت بەبێ گومان خێرایی و ئەدا کەی بەرزترە لە سلرۆن چونکە خێرایەکەیان جیاوازیەکی زۆری هەیە بەتایبەتی خێرایی پرۆسێسەرەکەی کە جیاوازی نێوانیان نزیکی ٧٠٠ مێگا هێرترز دەبێت بەمەش کاریگەری دەبێت لەسەر کارکردنی تەواوی بەرنامەکان بەتایبەتی بەرنامەکانی مەڵتی میدیا . ئەمە جگە لەمەش کە پنتیۆم فول کاشە دەتوانێت هەموو بەرنامیەك بکاتەوە .

## ٢٣ - پارێزەری شاشە (سکرین سیرڤر)

لەراستیدا ئەم خزمەت گوزاریە زۆر پێویستە کە لە هەموو کۆمپیوترێك کاربکات چونکە دەبێتە هۆی درێژکردنەوەی تەمەنی مۆنیتەرەکەت یان شاشەکەت لەبەر ئەوەی تەمەنی هەموو مۆنیتەرێك دیاریکراوەوە نزیکەی ٣٦٠٠٠٠ کاتژمێر دەبێت جا بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین پارێزگاری شاشەکەمان بکەین پێویستە کار بە پارێزەری شاشە بکەین بەڵام لێرەدا بونی پارێزەری شاشە کاریگەری دەبێت لەسەر خێرایی و کارکردنی کۆمپیوتەر بۆ نمونە ئەگەر ئێمە کاتی پارێزەری شاشەمان یەك دەقیقە دانا ئەوا هەرکاتێك بۆ ماوەی ٣٠ چرکە واز لە کۆمپیوتەر بێنین کۆمپیوتەر خۆی ئامادە دەکات بۆ کوژاندنەوەی شاشەکە بەمەش کاتێك دەست دەکەیت بەکارکردن کۆمپیوتەر خۆکاری شاشەکە دادەگیرسێنێتەوە ئەم دوو کردارە خێرایەش لەدوای یەك وادەکات کە ماوەیەك بوەستێت تا کۆمپیوتەر دێتەوە سەر باری ئاسایی خۆی جا بۆ ئەوەی ئێمە لەم کێشەیە رزگاریمان ببێت پێویستە کاتی کوژانەوەی شاشەو چونی بۆ پارێزەری شاشە کەمتر نەبێت لە ٣ دەقیقە .....زیاتریش نەبێت لە دە دەقیقە .

# (NORTON GHOST )

# تایبەت بە دروست کردنی وێنەی یەدەك بۆ سیستەم

## زنجیرەی یەکەم

ئامادەکردنی: ئیسماعیل خەلیل ئاکرەیی
ismail_aqrawe@yahoo.co

نۆرتۆن گۆست( Norton Ghost) یەکێکە لە بەرنامە بەهێزەکان کەتایبەتە بە دروست کردنی وێنەی یەدەك ( Back Up) بۆ سیستەم و بەشەکانی تری هاردیسك، کە ئەگەر جاریك سیستەمەکەت تێکچوو بە هۆی دابەزاندنی بەرنامەیەکی نەگونجاو لەگەل سیستەم یان دەست کاری کردن بە فایلەکانی سیستەم، یان دەست کاری کردن بە ئامادەکاری ریجیستەری یان هەر هۆکارێك بێت کە گاریگەری بکات لە سەر سیستەم ئەوە ئەو بەرنامەیە توانای هەیە کە سیستەمەکە بگەرێنێتەوە وەکو پێشوو کە یەکەم جار وینەیەکی یەدەکت بۆ دروست کردبوو بە رێگای ئەم بەرنامەیە، و لەباش دابەزاندنی ئەو بەرنامەیە هیچ جار پێویستیت بە فۆرمات کردنی سیستەم نابیت، وە هەروەها ئەم بەرنامەیە توانای هەیە کە وێنەی یەدەك بۆ هەر بەشێکی هاردێسك دروست بکات، یان لە هاردیسکێك بۆ هاردێسکێی تر، بەلاّم لەکاتی دروست کردنی وێنەی یەدەك (Back Up) بۆ سیستەم یان بۆ هەر بەشێك لە هاردیسك، نابێ لە ناو ئەو بەشە هاردێسکەکە دابنێیْ کە وێنەی یەدەکی بۆ ئەکەیت، بەلاّم ئەبێ لە ناو بەشێکی تری هاردیسکەکە دابنیێ، بۆ نمونە ئەگەر ویستت وێنەیەکی یەدەك بۆ بەشی ( C ) لە هاردەکە بکەیت، ئەوا ئەبێت وینەی یەدەکەکە لە ناو بەشی ( D ) لە هاردەکە دابنیێ، چونکە لە کاتی تێکچونی بەشی ( C ) لە هاردەکە، ئەو کاتە ئەتوانی ناوەرۆکی بەشی ( C ) بگەرینیەوە، ئەویش کەپێشوو لە بەشی ( D ) لە هاردەکە دات نابوو، و هەروەها ئەتوانی وێنەی یەدەکەکە (Back Up) لەسەر سی دی ( CD ) کۆپی بکەیت، پاشان هەر بە هۆی ئەم بەرنامەیە ئەتوانی بیگەرینیتەوە، بۆیە چەند هەنگاوێك هەیە دەربارەی چونیەتی دروست کردنی وێنەی یەدەك لە سیستەم یان بەشێك لە هاردیسك بکەیت کە ئیستا باسی ئەکەم.

لە سەرەتا ئەمەوی ئاماژە بە شتێکی گرنگ بکەم ئەویش ئەوەیە کە ئەم بەرنامەیە بە دوو رێگا ئەکرێ، لە رێگای دۆس و رێگای ویندوز ئەکرێ، بەلاّم من لێرەدا باس لە رێگای ویندۆز ئەکەم، و لە داهاتوو باس لە رێگای دۆسیش ئەکەم، و لەم زنجیرەیە باس لە چونیەتی دروست کردنی وێنەی یەدەك (Back Up) بۆ سیستەم ئەکەم و لە زنجیرەی داهاتوو باس لە چونیەتی گەراندنەوە( (Restoreوێنەی یەدەکی دروست کراوەکە ئەکەم. یەکەم جار ئەبێ سیستەمەکەت بە شێوەیەکی دروست دادبەزاندبێ لەگەل بەرنامەکان، پاشان دێین بەرنامەکە Setup ئەکەین، دێین بەرنامەکە

ئەکەینەوە روبەری بەرنامەکەمان بۆ دەرئەکەویت کە بریتیە لە سێ هەڵبژاردە بروانە وینەی ژمارە(١ )




یەکەم جار کلیك بکە لەسەر هەڵبژاردەی یەکەم کە نوسراوە Back Up کە لە وینەکە ئاماژەم پێ کردووە، پاشان لە وینەی دووەم




تەنها کلیك بکە لەسەر Next ، پاشان لە وێنەی سێیەم






ئەو بەشە هاردە هەلبـژێرە کە وێنـەی یـەدەکی بۆ ئەکەیت، ئێمە بەشی ( C ) هەلدەبژێرین و وێنـەی یەدەکی بۆ ئەکەین چونکە بە گرنگ ترین بـەش لـە هاردیسك دادەندرێت چونکـە سیستـەم لـە خۆە ئەگرێتەوە، پاشان دەبینین لـە بەرامبـەرەکەی دوو خانە هەن، ئاماژە لەلای خانەی File دابنیٚ و کلیك بکە لە سەر Next ، ولە وێنەی ٤




کلیك بکە لەسەر ئایکونی Browse و ئەو بەشە هاردە هەلبژێرە کە وێنەی یەدەکی تێایدا دابنیـیٚ، ولە وێنەی ٥




لـەخانـەی save in بـەشـی (D ) لـە هـاردەکـە هەلبژێرە و لە خانەی file nameناوێك بۆ وێنـەی یەدەکەکە دابنیٚ بۆ نمونە ناوی ISMAIL دائەنێن و پاشان کلیك بکە لـە سـەر فـەرمانـی Save ، ولە وێنەی ٦




لە خانەی Image file name ئەبێ ناوەکە بەم شێوەیە نوسرابێ D:\ISMAIL.gho پاشان کلیك بکە لە سەر Next، بۆ زانین ناکرێت وێنەی یەدەکەکەی دروست کراو لە هەمان بەشدا دابنیێ، چونکە ئەگەر سیستەمەکەت تێکچوو ناتونیت بگەرینیتەوە، ئەبێ لە بەشێکی تری هاردیسکەکە دابنێ ، پاشان جوارگۆشەکمان بۆ دەرئەکەوێت کلیك لەسەر OK بکە بڕوانە وێنەی ژمارە ٧




پاشان چوار گوشەیەکی تر دێت کلیك لەسەر Nextبکە بڕوانە وێنەی ژمارە ٨ ،




و لە چوار گوشەکەی تر تەنها کلیك لەسەر Next بکە بڕوانە وێنەی ژمارە ٩




پاشان لە وێنەی ژمارە ١٠




چوار گوشەکەمان بۆ دەرنەکەوێ دوو هەڵبژاردەی تیدایە، کلیك لەسەر ئەو هەڵبژاردەیە بکە کە نوسراوە ( Continue)، پاشان چوارگۆشەیەکی تر دێت کە پێزانینمان ئەداتێ دەربارەی قەبارە و جیگای وێنەی یەدەك کە پێشتر دامانابوو، پاشان کلیك بکە سەر فەرمانی (Run Now ) بڕوانە وێنەی ژمارە ١١




و لە کۆتایی چوار گوشەکەمان بۆ دەرنەکەوێت کە ئەڵێ نۆرتۆن گۆست دەست بەکاری خۆی ئەکات و کۆمپیوتەرکەت ڕێستارت ئەکات، کلیك لەسەر OK بکە بڕوانە وێنەی ژمارە ١٢ .

لەو کاتە کۆمپیۆتەرکە لە خۆیەوە ریستارت ئەکات و لە پاش چەند چرکەیەك نۆرتۆن گۆست دەست بەکارئەبێ و وینەی یەدەك بۆ ئەو بەشە هاردە دروست ئەکات کە لە پێشوو هەلمان بژاردبوو، و ئەم کردارە نێزیکی ( ١٠ تا ١٥) خولەك ئەخاێنی بروانە وێنەی ژمارە ١٣



(13)

و لەپاش تەواو بوونی کۆپی کردنەکە چوار گوشەیەکی بچوك دێت کە ئەلێ کردارەکە تەواو بوو تۆ کلیك بکە لەسەر فەرمانی Continue ، و لە کۆتایی کۆمپیۆتەرکە لە خۆیەوە ریستارت ئەبێتەوە و وێنەیەکی یەدەك بۆ سیستەمەکەت یان ئەو بەشە هاردەی کە سیستەمەکەی تێدایە دروستی کردووە، بۆ بینینی وێنەی یەدەکە دروست کراوەکە بچوو بۆ بەشی D لە هاردەکە، ئەبینی وێنەی یەدەکەکە وەکو فایلێکی imag لە بەشی هاردی D دروست بووە بروانە وێنەی ژمارە ١٤



(14)

ئێستا وێنەیەکی یەدەکت هەیە لە سیستەم، و هەر کاتی سیستەمەکەت تێکچوو ئەوە ئەتوانی بەچەند هەنگاوێك کە بەهەمان بەرنامە سیستەمەکەت وەکو پێشوو بە ڕێگای فەرمانی Restore بگەڕێنیتەوە کە لە زنجیرەی داهاتوو باسی ئەکەم.

# زیاد کردنی ژمارەی فایلە کراوەکان لە بەرنامەی وۆرد

هیوا ئیبراهیم سلێمانی

من نامەویٚ لە پێشەکی ئەم بابەتە باسی گرنگی و بەسودی ئەم بەرنامەیە بکەم چونکە بەرێزانی تر لەم گۆڤارە لە بابەتەکانیان باسیان کردووە بەرنامەی وۆرد لە ئاسانی بەکارهێنانیدا زۆر خزمەت گوزاری ئاسانکاری تێدایە یەکێك لەمانەو لەهەمویان پێویست تر زیاد کردنی ژمارەی فایلە کراوەکانن لە بەرنامەی وۆرد . مەبەستمان بەرنامەی وۆرد لە کاتی کارکردنی و کردنەوەی فایلەکان و یان دروست کردنیان تەنها سێ فایل لەلیستی کردنەوەی خێرا پیشان دەدات بەلاٌم ئێمە دێین زیادیان دەکەین بۆ ئەو رادەی کە پێویستمان پێیەتی بۆ نمونە من کردومەتە هەشت بەش ، ئەم کردارەش سودی زۆرە چونکە ئەم فایلە لە هەر شوێنێك خەزن کرابێت ئەوا پێویستت بە تەنها یەك کلیك هەیە بۆ کردنەوەی بەلاٌم ئەگەر وەکو جاری پێشو ئەوا دەبوایە لەبەشی کردنەوەی فایلەکان بەدوایدا بگەرێیت و بیکەیتەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوەش دێین لەناو بەرنامەی وۆرد کلیك لەسەر (Tools) دەکەین پاشان (Options) هەڵدەبژێرین بروانە وێنەی (١)




وێنە ژمارە ( ١ )

دواتــر بــۆ کسێـك دێــت بەشـــی (General) هەڵدەبژێرین بروانە وێنەی (٢)



وێنە ژمارە ( ٢ )

پاشان لەبەشی ( Recently used file list) ژمارەکە بە پێی پێویستی خۆمان زیاد دەکەین تاکو نۆ ژمارە رێگە پێدراوە زیاد بکەین بۆ نمونە من ژمارکەم کردۆتە هەشت لەدوای داخستنی ووردو کردنەوەی دوبارە دەبینین ژماری فایلەکان لە سێوە زیادیان کردوە بۆ ئەو ژمارەی کەزیاد کراوە ئەگەر بروانیتە وێنەی ژمارە (١) ئەوا دەبینیت تەنها سێ فایل لە لیستەکەدا هەن بەڵام بروانە وێنەی ژمـــارە (٣)



وێنە ژمارە ( ٣ )

کە دەبینێت لە بەشی لای چەپ و تایبەت بە کردنەوەی فایلەکان بەشێوەیەکی خێرا هەشت فایل زیادیان کردووە بەمەش لەدوای ئەم هەنگاوە هەموو کاتێك هەشت فایلی ووردتت بۆ ئامادەیە کەتەنها بە یەك کلیك دەکرێنەوە . بەمەش دەتوانیت بە کورترین ماوە تا هەشت یان ئەو ژمارەی کە بۆ خۆت پێویستن لە فایلەکانی وورد بکەیتەوە .

# ڕۆڵی تەکنەلۆژیـــــا لەسەر ڕاگەیاندنی خوێندراو

ئامادەکردن وفۆتۆ
ڕێناز ئەردەلان

لە کاتێکدا کە تەکنەلۆژیا توانیویەتی کاریگەری خۆی لەسەر زۆربەی بوارەکانی ژیانی ئەم سەردەمە دا بکات بواری ڕاگەیاندنیش یەکێکە لەو بوارانەی کە لە کاریگەری ئەم تەکنەلۆژیایە بێ بەش نیەو کـاریگـەری کردۆتە سەر بە تایبەتی راگەیاندنی خوێندەوار بۆ زانینی پەرە سەندن و پێشکەوتنەکانی رۆژنامەو گۆڤارەکان بە هۆی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ڕووی پرسیارمان ئاراستەی چەند ڕۆژنامەنووسێك کرد کە بەم جۆرە هـاتـنـە دوان .



**بـــەرێز فـــەرزین کەریـــم**
**سەرنووسەری گوڤاری هونەری نوێ دەڵێت :-**

بە شێوەیەکی ئاشکرا دیـارە کۆمپیوتەر و ئەنتـەرنـێـت چـەنـد ئاسانکاری سەبارەت بە راگـەیـانـدن کردوە بە تایبەتی بواری رۆژنامەوانی بە نمونە ئێمە گۆڤارەکەی خۆمان بـە زەقی شوێن پەنجەی ئەنـتـەرنـێـت و کۆمپیوتەری پێوە دیارە بەشێکی ئەم گۆڤارە پـەیـوەسـتـە بـە هـەواڵـە زیندوەکانی هونەرمەندان و هەروەها پرۆژە هونەریەکانی جیهان کە ئەگـەر ئەنتەرنێت لەبەر دەست دا نـەبـێـت هەواڵەکان بە ئاسانی ناگاتە دەستمان هەروەها پەیوەندی کردن بە هونەرمەندان لە شوێنە جیاجیاکانی جـیـهـان هـەنـدێك لـە ڕیپۆرتاژەکان بە هۆی ئەنتەرنێتەوە هەروەها کۆمپیوتەریش پرۆسەی کارکردنی پراکتیکی لە ناو راگەیاندنی خـوێـنـەواردا کـاریـان کردووە . لە هەموو ڕوویەکەوە کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت بونەتە بناغەیەك بۆ بواری رۆژنامەوانی کە ئەگەر ئەم بناغە نـەبـێ ئـەو دیوارەی کە لە سەری بینا کراوە خۆی لە خۆیدا دەروخێ .



### بەڕێز کاروان عبداللە سەرنووسەری گۆڤاری کاروان بەم شێوەیە تیشکی خستە سەر ووتەکانی :-

گومانی تێدانیە ڕۆژنامە و گۆڤار بە شێوەیەکی گشتی بە قۆناغێکی جیا تێپەڕ بووە کە ئەمەش کۆمەلێك فاکتەر هەن کاری تیٔ کردون ئەمانە شتێکن ئەگەر بێت و باسی لێوە بکەین دەبیٔ دەست نیشانی ئەوە بکەن کە ڕۆڵی زۆر گرنگی بینیوە. ئەگەر کەمێك بگەڕێنەوە بۆ دواوە بۆمان دەردەکەویٔ کە جاران ڕۆژنامەو گۆڤار بە چ زەحمەتێك دەردەچوو چ توانایەکی مرۆڤی دەویست بۆ ئەوەی کە گۆڤارێك دەربکریٔ یان ڕۆژنامەیەك بلاۆبکرێتەوە ئەوەی کە جێگای باسە کوردستان ڕاستە بە بەراورد لەگەڵ هەندێك وولاتی تر دەرەنگ زۆر کەم گواستنەوەیەکی جۆری لە بواری ڕۆژنامەگەری کوردی سەری هەڵدا گواستنەوەیەك کە ڕەنگ بیٔ تۆڵەی دەیان ساڵی سستی و خاوی بەرەو پێش چونی ئەو ڕۆژنامەگەریە کرایەوە ئەو گواستنەوەیە کاریگەری زۆری هەبوو نەك هەر لەسەر پێش خستنی گۆڤارو ڕۆژنامەکان بەڵکو لەسەر پێش خستنی بیری ڕۆژنامەنووسان لەوەی چۆن ڕۆژنامە پێش بخەن چونکە تەکنەلۆژیا هۆکارە بۆ پێش خستنی ڕاگەیاندنی خوێندەوار بۆ نمونە گۆڤاری ( کاروان ) بۆ ماوەی ( ٢٥ ) ساڵە دەردەچێت ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ ژمارەکانی پێشوو زۆر بە ڕوون و ئاشکرا ئەوەی پێوە دیارە کە لە ڕووی تەکنیکیەوە کۆمپیوتەر ڕۆڵی خۆی بینیوە پێشکەوتنێکی زۆری بەخۆیەوە بینیوە لە داهاتووش ئەم ڕۆڵ و پێشکەوتنی کۆمپیوتەر بەردەوام دەبێت .



### بەڕێز ئەیوب گەلالی ڕۆژنامەنووس دەڵێت :-

بێگومان کاریگەری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت لەسەر ( ماس میدیا ) بە شێوەیەکی گشتی و ڕاگەیاندنی خوێندەوار بە تایبەتی ئێجگار زۆرە هەڵبەتە ئەم تەکنەلۆژیایە لایەنە بۆزەتیڤەکانی لە ڕووی خێرایی تەکنیکی گەیاندنی پەیامەکان بە زووترین کات بۆ خوێنەر لە ڕووی چاپ و شێوازی ناوەڕۆکیتەوە دیارو بەر چاون تەنانەت هەندێك لە ڕۆژنامەو گۆڤار سودێکی زۆریان لە ( میدیای ئەلکترۆنی ) و سایتەکانی ئەنتەرنێت لە ڕووی وەرگرتنی بابەتەکان وەرگرتوە کە بێگومان ئەوەش لایەنێکی بۆزەتیڤانەیە بۆ خوێنەر بە تایبەتی ئەوانەی دەرفەتی ئەوەیان نیە ئەنتەرنێت بەکار بهێنن .



**بەڕێز بێکـەس حمـە قـادر سەرنووسـەری هەفتەنامەی کورد ڤین :-**

ئەمرۆ گەربۆ چەند ساتێك هێڵی ئەنتەرنێت ببچرێت ئەوا ڕۆژنامەو گۆڤارەکان پەکیان دەکەوێت چونکە بۆ ئاگاداربوون لە زانیاری نوێ و جیهان تاکە سەرچاوەیە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بۆتە بەشێك لە ژیانمان ڕۆژنامەو گۆڤارەکان لە بواری چاپ و نەخشەسازی و چاپ سودێکی زۆر لە کۆمپیوتەر وەردەگرن بە بۆچونی من گەر ئەم تەکنەلۆژیایە لای ئێمە نەبا ئەو کات کوردستان دەبووە ئەشکەوتێکی دابراو لە جیهان .



**بەڕێز عومەر سەید زادەی ڕۆژنامە نووس بەم شێوە دوا :-**

بێگومان چ ئەنتەرنێت و چ کۆمپیوتەر کاریگەری یەکی زۆر گەورەیان هەبووە لە پێشخستنی ڕاگەیاندنی خوێندراو . ئەنتەرنێت وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی زۆربەی زانیارییەکانی جیهانە ڕەنگە هەر بابەتێ بتەوێ دەستت بکەوێ سەرچاوەیەکی سەرەکی هەواڵە بۆ ڕۆژنامەو گۆڤار . کۆمپیوتەر لە ڕووی چاپ و کاری هونەریەوە کاریگەری زۆری هەیە وەك ( چاپ ) ئالەتێکی زۆر باشە بۆ بابەت چاپ کردن هەروەها دەتوانیێ هەڵەکان بە کەمترین کات و ماندووبونی جاران چاك بکەیتەوە جاران کە لە ( تابعە ) ی دەست هەبوو . ئەگەر هەڵەیەك بکرابایە کێشەی دروست دەکرد چونکە ئەگەر دێڕێك بپەڕی بایە دەبا سەر لە نوێ بابەتەکە چاپ بکرێتەوە بەڵام ئەمرۆ وانیە دەتوانیێ بە ئاسانی ئەم کتێبخانە بەهۆی کۆمپیوتەر چارەسەر بکەی هەروەها لایەنی کاری هونەری لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بە ئارەزووی خۆتە دەتوانیێ بە ئاسانی کاری تێدا بکەی ئەوەش جاران کە لایەنی هونەری بە دەست دەکرارەنگە ناشرین دەرچوبا بە ئاسانی چاك نەدەکرایەوە دەبایە سەر لە نوێ بیگۆڕی ئەوەی جاران بە ( چوار ) کاتژمێر دەکرا ئیستا بەهۆی تەکنەلۆژیا دەتوانیێ بە ماوەی ( ٢٠ ) خولەك بیکەین، بە شێوەیەکی جوانتریش لەوەی پێشوو .



## بەڕێز ئەبوبکر اسماعیل ڕۆژنامە نووس دەڵێت :-

ئەگەر تا دوێنێ ڕاگەیاندنی خوێندراو لە زۆر لایەندا کێشەی دەهاتە بەردەم و بۆشایی بۆ دروست دەبوو ، ئەوا ئەمڕۆ تەکنەلۆژیای سەردەم ( ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر ) توانیویەتی سودێکی بەر چاو بە ڕۆڵی ڕاگەیاندنی خوێندراو بدا و ئەو بۆشایە پڕ بکاتەوە کە ڕۆژنامەوانی تووشی دەهات ، لە رووی ناوەڕۆك و لایەنی وێنەی جۆراو جۆر ئەگەر بەراودێکی ئێستاو رابردووی ڕاگەیاندنی خوێندراو بکەین ئەواجیاوازیەکی بەرچاو بەدی دەکرێ بە تایبەتی لە رووی ڕێك خستن و دانانی وێنەی جۆراو جۆر، چونکە زۆربەی ئەو بلاْوکراوانە دەردەچن تەژین لە وێنەی جۆراو جۆر کە بێگومان جوانیەك و خۆشیەك بەو بابەتە دەبەخشێ کە بلاْو دەکرێتەوە ئەمەش جیاوازیەکی بەر چاوە لەگەڵ بلاْوکراوەکانی پێشوو وە تایبەتمەندی و سودەکانی تەکنەلۆژیای سەردەم دەردەخات لە ڕووی کار ئاسانیەوە لە بواری ڕاگەیاندن بە گشتی و بە تایبەتی ڕاگەیاندنی خویندراو، ئەمەش پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای سەردەمە .



## بەڕێز خاتوو نیان سەرنووسەری گۆڤاری شەنگ :-

بێگومان بۆ کاری ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندن کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت یەکێکە لەو پێویستیانەی کە دەبێت ڕۆژانە بەکار بهێنین رون تر بلێین میکانزمێکی هەڵسوڕێنەری ئەم پیشەیە ئەگەر کۆمپیوتەر نەبێت بە ئاسانی ناتوانین کارەکان بەڕێوە ببەین لەبەر ئەوەی ئەم ئامێرە کار ئاسانی بۆ کارەکان دەکات ئەنتەرنێتیش تەواوکەری کارەکانە چونکە بێ بەکارهێنانی ئەنتەرنێت کارەکان جۆرە لاسەنگێکی پێوە دیارە دەبێت چونکە ئەو زانیاریانەی کە لە ئەنتەرنێت وەری دەگرین زۆر بە زەحمەت لە ڕۆژنامە و بلاْوکراوەکان وەردەگرێ بە نمونە من بو هەندێك بابەت و وێنەی ئافرەت بۆ گۆڤاری ( شەنگ ) پەنا بۆ ئەنتەرنێت دەبەم زۆر بە ئاسانی دەستم دەکەوێ بۆیە دەڵێم تەکنەلۆژیا ڕۆڵێکی ئیجابی و گەورەیی هەیە لەسەر پێشکەوتنی ڕاگەیاندنی خویندراو .



## بەڕێز ئەحمەد ئیسماعیل سەرنووسەری هەفتەنامەی وەرزش دەڵێت :-

لە سەردەمی ئیستای ڕۆژنامەگەری ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر فاکتەرێکی گرنگە بۆ ئاسان کاری و بەرەو پێش چوونی ڕاگەیاندنی خویندراو بۆ نمونە ئێمە لە مۆندیالی تۆپی پێ ئەم ساڵ سودێکی زۆرمان لە ئەنتەرنێت وەرگرت بۆ بەدەست هێنانی وێنەو هەواڵی مۆندیال کە بە چرکە بەدەستمان دەگەیشت هەروەها کۆمپیوتەر بۆ نەخشەسازی و تایپ کردن بۆیە دەلێم کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت فاکتەرێکی گرنگن لە پێشکەوتن و داهێنانی سیمای نوێ لە جیهانی ڕاگەیاندنی خویندراو .



## بەڕێز فەیصەڵ دیهاتی ڕۆژنامەنووس دەڵێت :-

هەڵبەت پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای ئەلکترۆنی ئەمرۆ هاسانکارییەکی هێجگار هێجگاری بۆ مرۆڤ کردووە و لە خزمەتی کارو بارەکانی مرۆڤدا، دەکرێ بلێم ئێستا لە ڕێگای تۆرەکانی ئینتەرێت و کۆمپیوتەرەوە جیهان بۆتە گوندێکی بچوک ، هەریەك لە ئۆفیسی خۆی دادەنیشێ لەسەر شاشەکەی بەردەمیدا پەیوەندی بە دنیاوە دەکات و لەگەڵ دنیادا قسان دەکات، دونیای لەبەر چاوە هەر لە کۆمپانیای فرۆکەو دەزگای چاپ پەخشی ڕۆژنامەوانی و کەرەسەی بینیادنان و رادیۆو تەلەفزیۆن و کارگەی جۆراو جۆر تا دەگاتە بچوکترین شت ، هەنووکە لە وولأتانی پێشکەتوو لە ڕێگای ئەم تەکنەلۆژیایەوە حکومەتی ئەلکترۆنی دانراوە، هەموو دامو دەزگاکانی حکومەت بە تۆری کۆمپیوتەر بە یەکتر بەستراوە، بۆ هەر کارو فەرمانێك ژمارەی تایبەت هەیە و هەر کەسە لە شوێنی خۆی چی بوێت دێتە بەردەستی ، لەو بڕوایە دام لە ئایندەیەکی نزیك ئێمەش سوود لەم پیشەسازییە پێشکەتووە وەردەگرین ، هەر چەندە کۆمپیوتەرەکانی ئیستا دەزگاکانمان تەنیا بۆ دیکۆرەو بەس ، بەداخەوە .

# بۆ زیاتر ڕێگەگرتن لە هاکەرەکان

ئا: هۆگر حمه فرج سلێمانی

کێشەو گرفتی دزینی زانیاریە نهێنیەکان وەکو ژمارەی نهێنی پۆستی ئەلیکترۆنی یان سایتەکەت یان ژمارەی حسابی ئەلیکترۆنی و کارتی بانك و کارتی مامەلەکردن لە سەر ئەنتەرنێت زۆرەو زۆرمان بیستوە بۆ هەموو ئەو کەسانەو بۆ هەموو ئەوکەسانەش کە زۆر سەردانی ئەنتەرنێت دەکەن بەتایبەتی لە قاوەخانەکان پێوستە ئاگاداری ئەوەبن کە هەموو ئەو کردارو هەنگاوانەی کە لەسەر ئەنتەرنێت پێیدا تێپەردەبیت خەزن دەبێت بەمەش زۆرئاسانە بۆ ئەو کەسانەی بەدوای ئەم زانیاریانەدا دەگەرێن بەئاسانی بگەنە ئەم زانیاریانە. جا بۆ ئەوەی لەم گرفتە رزگاریمان بێت ئەوا پێویستە ئەو کۆمپیوتەرەی کاری لەســەر دەکەین ئــەم هەنگاوانـــەی بۆ بهاوێین لە سەرەتادا لە کۆنترۆل پەنالەوە دەچینە ســەر (Internet Options) لەوێش بۆ (Advanced) بڕوانە وێنەی (١)



وێنە ژمارە ( ١ )

بەشی (Security) بروانە وێنەی ژمارە (٢ ) لەم بەشەدا بەشی خەزن نەکردنی پەرە مشەفەرکان دەست نیشان دەکەین ( Do not save encrypt page s to disk) دواتر کلیك لەسەر (Ok) دەکەین . بەمەش هەموو ئەو خزمەتگوزاریانەی سەرەوە کە ناوم هێناون ئەگەر لە هەرشوێنێك بیانکەینەوە ئەوا هیچ لەم زانیاریانە لەناو کۆمپیوتەر خەزن نابن و بێ ترس پاسۆردەکانی خۆمان بەکاردێنین .



وێنە ژمارە ( ٢ )

# مانای ئەو ژمارانەی کە لەکاتی پەیوەندی بە ئەنتەرنێتەوە دەردەکەون لەکاتی بوونی هەڵە

## زنجیرەی شەشەم

حسن عمر حسن

٧٥٦ - لە پێشدا پەیوەندیەکە بەستراوە

٧٥٧ –ئاگاداربە تەواوی خزمەت گوزاریەکان لە کۆمپیوتەری ناوەندوە ئامادە کراون

٧٥٨ - پەیوەندیت بە هێلی ئەنتەرنێت لە پێشدا بەستووە

٧٦٠ - هەڵەیەك رویداوە لەکاتی بەستنی پەیوەندیدا

٧٦١– لەکاتی هەوڵدانت بۆ پەیوەندی کردنت بە ئەنتەرنێت هەڵەیەك رویداوە

٧٦٣ - ئاگاداربە لە دوو پەیوەندی زیاتر هەیە لە هێلی ناوخۆ پێویستت بە دوبارە پەیوەندی کردنەوە هەیە بە ئەنتەرنێت .

٧٦٤– کارتی پەیوەندیت جێگیر نەکراوە

٧٦٥ - پێویستە هاوبەشیکردنت لەگەڵ ئەنتەرنێت تەواو بکەیت ئەویش بەدانانی IP تایبەت بە پەیوەندی کردن بۆ گەیشتنی خزمەتگوزاری ئەنتەرنێت .

٧٦٦ - سیستەم ناتوانێت هیچ ئاماژەیەکی تایبەت بە پەیوەندی بدۆزێتەوە

٧٦٨ - هەوڵی پەیوەندیەکەت شکستی هێنا بەهۆی شکستی تەشفیری بەیاناتەکان

٧٦٩ - تۆری ئەنتەرێت ناتوانرێت بگاتە کۆمپیوتەرەکەت

٧٧٠ کۆمپیوتەری ناوەند هەوڵی پەیوەندیەکەتی رەت کردەوە

٧٧١ لەبەر ئەوەی شەبەکە مەشغولە پەیوەندیەکەت فەشەلی هێنا

٧٧٢ - کۆمپیوتەر ناوەند هاوبەش نیە لەگەڵ داواکاری تۆ

٧٧٣ - پەیوەندیەکەت فەشەلی هێنا چونکە ژمارەی پۆرتی کۆمپیوتەری ناوەند گۆردراوە

٧٧٤ - پەیوەندیت فەشەلی هێنا دوبارە هەوڵ بدەوە

٧٧٥ - کۆمپیوتەری ناوەند رێگرە لە گفتوگۆکردنت

٧٧٧ - پەیوەندیت فەشەلی هێنا چونکە مۆدێمی کۆمپیوتەری ناوەند لەکارکەوتوە

٧٧٨ ناتوانیت زانیاری وەرگریت لەسەر کۆمپیوتەری ناوەند

٧٨٠ فەرمانێکی هەڵەت داوە کۆمپیوتەر ناتوانێت جێ بەجێ بکات .






# هەموو شتێك لە ئەنتەرنێت بدۆزەرەوە

## بەشی چوارەم کۆتایی

ئەژین شێرکۆ

دەتەوێت لە ئەنتەرنێت بەدوای چیدا بگەرێت ئارەزوی چ دەکەیت ئەوا پێویستت بە ماڵپەرەکانی گەڕان هەیە من لێرەدا هاوکار دەبم بۆ ئەوەی بتگەیێنمە ناو هەموو ئەو بزوێنەرانە کە تۆ ئارەزوویان دەکەیت بۆ نمونە من ئارەزوی گەران بەدوای بەرنامەدا بکەم یەکێکی تر حەز دەکات زانیاری لەسەر ماڵپەرکانی تایبەت بە کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت پەیدا بکات بۆ ئەوەی بگەیتە هەرچی دەتەوێت بەدەستی بێنێت سەردانی ئەم سایتانە بکە :



سکرین سێرڤر

http://screensavershot.com/misc.htm

چات کردن

www.heartchat.com

دیزاینی عربی

http://www.des4arab.com

فێربونی کۆمپوتەر و ئەنتەرنێت

http://beelal1.cjb.net

داهێنەران

http://www.suhuf.net.sa/2001jaz/jun/14/cu15.htm

کارتی ئیماراتی

http://www.uae4all.net/ecard/help.shtml

ماڵپەری رەحال

http://www.alrhal.com

وێنەی کۆمیدی

http://yawwar.com/funnypic.htm

جیهانی روناك

http://www.alnoor-world.com

ماڵپەری ساهر

http://www.alsaher.net

قوتابخانەی عەرەبی

http://www.schoolarabia.com

١٢٠ وانە بۆ فێربونی فلاش

http://www.kulaib.8m.com/flash%20study.htm








بیرکاری

http://zohair.8m.com

١٠٠ پارچە شیعری خۆشەویستی

http://www.angelfire.com/al/horizons/love50.html

فیرعەونی نیل

http://www.egypt1.i8.com

دکتۆری کۆمپیوتەر

http://www.angelfire.com/tv/doctoreid/love12.html

ماموستای عەرەبی

http://www.geocities.com/dyaa70

بەرنامەی وەزنەك زەهەب

http://www.al-waham.net/gold/index.htm

ددان

http://www.zumorod.s5.com

لەگەڵ خۆشەویستی

http://lost_romance.tripod.com/WIMChs.htm

وانەکانی فلاش

http://www.saudint.com/flash/index.htm

ناوەندی عرب بۆ بەرنامەی فلاش

http://www.ifawal.com/ar

چۆن سایتێك دروست دەکەیت

http://www.saudint.com/buildsite/index.htm

پەرتوك بۆ داگرتن

http://www.islammessage.com/books/a/bookslinks.htm

کۆربەندی فنان

http://www.alfnnan.net/forum/showth...hp?threadid=172

تایبەت بە منداڵ

http://www.bab.com/clubs/club_elect...=18&parentid=18

تایبەت بە مۆبایل

http://www.mudhish.f2s.com/mobilprogrames.htm

یاری

http://games4arabs.com/memory/memor...MemoryGame.html

# سەرباری دەست بالآبوونی Google لە خزمەتگوزاری گەران Yahoo دەست بەسەر بەشێك لە خزمەتگوزاریەكانی تری ئینتەرنێت دادەگرێت

وەرگێرانی لە عەرەبییەوە
دیار عەزیز
سە رچاوە : البوابة العربية




لە لێكۆلینەوەیەكیدا سایتی (hit wise) گرنگترین ئەو خزمەتگوزاریانەی خستە بەرچاو كە زۆرترین بەكارهێنەریان هەیە لە نێوان كۆمپانیا بەناوبانگەكانی ئینتەرنێت ، بەپێ ی لێكۆلینەوەكە لە خزمەتگوزاری گەران كۆمپانیای Google بەبێ ركابەر لەخانەی یەكەم دێت بە راكێشانی رێژەی (٤٧,٤٪) ی سەرجەم بەكارهێنەرانی گەران لە ئینتەرنێت دوای ئەویش ركابەرە هەمیشەیەكەی كۆمپانیایYahoo لەخانەی دووەم دێت بە كۆكرنەوەی رێـــژەی (١٦٪) ی بەكارهێنەرانی گەران بەدەوری خۆی هەروەها كۆمپانیای (msn) خانەی سێ یەمی بەركەوت بە رێـــژەی (١١,٥٪) دوای ئەمیش كومپانیای (aol) خۆی لە خانەی چوارەم بینیەوە بە كۆكرنەوەی رێژەی (٧,٦٪) خانەی پێنجەم و كۆتایی بووە بەشی سایتی (ask.com) بە رێژەی (٥,٩٪) ی بەكارهێنەرانی گەران .

بەلأم سەبارەت بە خزمەتگوزاری پۆستی ئەلیكترۆنی و هەوالەكانی جیهانی كار ئەنجامەكان گۆرانكاریان بەسەر دا هات بە شێوەیەك كۆمپانیایYahoo دەستی بەسەر خانەی یەكەم گرت بە راكێشانی (٤٢,٤٪) ی سەرجەم بەكارهێنەرانی پۆستی ئەلیكترۆنی بۆخۆی بەلأم خانەی دووەم بەر خزمەتگوزاری msn hotmail كەوت بە رێژەی (٢٩,٩٪) بەلام خزمەتگوزاری( g mail) ی تایبەت بە Google خۆی لە خانەی چوارەم بینیەوە بە كۆكرنەوەی رێژەی تەنها (٢,٥٤٪) ی بەكارهێنەرانی پۆستی ئەلیكترۆنی دوای خزمەتگوزاری ( my spaice mailكە لە خانەی سێ یەم دێت بە رێژەی (١٩,٥٪) ی بەكارهێنەرانی پۆستی ئەلیكترۆنی.

بەلأم ئەوەی تایبەت بێت بە جیهانی هەوالّ و و كەشناسی كۆمپانیایYahoo دووبارە سەر كەوتوو بوو بەسەر ژمارەیەك سایتی وەكو cnn, wether chnel,msnce كە تایبەتمەندن بەم بوارە بە راكێشانی (٦,٣٪) ی ئارەزوومەندانی ئەم بوارە بۆخۆی ، لە بەرامبەریشدا Google لە خانەی پێنجەم هات بە رێژەی (١,٩٪).

سەرباری ئەمانە كۆمپانیایYahoo پارێزگاری لە خانەی یەكەم كرد لە خزمەتگوزاریە داراییەكان بە كۆكرنەوەی رێژەی (٣٤,٩٪) بەكارهێنەرانی ئەم خزمەتگوزاریە دوای ئەمیش خزمەتگوزاری(msn moneycentral) رێـــژەی (٣٤,٩٪) بەكارهێنەرانی ئەم خزمەتگوزاریەی بەركەوت لە لایەكی ترەوە خزمەتگوزاری (google finance) خۆی لە خانەی چلەمین بینیەوە بە رێژەی تەنها (٠,٢٩٪) . بەلأم خزمەتگوزاری گەشت و گوزارو نەخشە تارادەیەك ئەنجامەكانی گۆری بە جۆرێك خزمەتگوزاری (map quest) ی تایبەت كومپانیای(aol رێژەی (٥٦,٣٪) بەكارهێنەرانی كردە بەشی خۆی خانەكانی دووەم سێیەمیش بوونە بەشی هەردوو كومپانیایYahooو Googleبەرێژەكانی (٢٠,٥٪ و ٧,٥٪) . جێی ئاماژە پێدانە Google پارێزگاری لە پێگەی خۆی دەكات بە پێشكەشكردنی خزمەتگوزاریەكانی گەران بۆپارێزگاری كردن لە قازانجانەی كەوا بەدەستیان دەهێنێ.

# دروست کردنی سایت لە رێگای WWW PHOTO ALBUM

ئا : زانا رسول

ئەم بەرنامەیە بەگرنگ وەرگرن بەتایبەتی بۆئەوانەی حەز بە دروستکردنی سایت دەکەن یاخود ئەوانەی سایت یان هەیە لەئەنتەرنێت بێگومان هەمومان حەز بەشتی نایاب دەکەین ئینجا لەهەرچی بوارێك بێت بەلاّم بواری ئەنتەرنیچت وەك هیچ شتی تر نیە بەردەوام پێویستی بەشتی جوان و شتی نوی هەیە بەرنامەی WWW Photo Album یەکێکە لەوبەرنامە گرنگانە کەتوانای دروستکردنی ماڵپەرەکانی ئەنتەر نیتیان هەیە وەکو بەرنامە Front Paeg و بەرنامەی Wep Menu جۆرەها بەرنامەی تر بەرێزان ئەم بەرنامەیە دەتوانێت کۆمەڵێك وێنە بەیکەوە کۆبکاتەوە پاشان بیانکاتە یەك ماڵپەر بەشێوەیەکی جوان و هەروەها باگراوندێکی جوانی بۆ دروست بکات. سەرەتا پاش دابەزاندی بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەر ئینجا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان لەسەرەوە لەلای راست Greate هەیە یەکجار کلیکی لەسەر دەکەین پاشان لیستێك دێتە بەرچاو بۆشاییەك لەناوەراستی بەرنامەکە هەیە و لەتەنیشت بۆشاییەکەش Browse نوسراوە یەك جار کلیکی لەسەر Browse دەکەین وێنە ١




وێنە ( ١ )

پاشان لیستی هاردەکان دەبێتەوە تۆش ئەو وێنانەی لەناو هاردەکەت داتناوە بۆ سایت دێیتە سەر ئەو فۆلدەرە ok دەکەیت وێنە ٢



وێنە ( ٢ )

پاشان لەخوارەوە نێکست دەکەیت لیستێکی تر دێت کە وێنەکان دیاری دەکات وێنە ٣



وێنە ( ٣ )

دیسان نێکست دەکەیت پاشان لیستێکی تردێت کە باکراوندەکان دیاریدەکات تۆ کامت دەوێ بەماوس دیاریدەکەیت وینە ٤ دیسان نێکست دەکەیت پاشان دوبارە نێکست دەکەیت ئینجا دوا لیست FINISH هەلدەبژێریت چەند چرکەیەك چاوەرێدەکەیت تا ریندەرەکە تەواو دەبێت ماڵپەرەکە دەچێتە پرۆگرام فایل و لەوێوەش دەچێتە ناو فایلی بەرنامەی فـــۆتـــۆئـــەلـــبـــوم WWW.PHOTOALBUM



وێنە ( ٤ )

# چۆن کارتەکانی ڤیزاو ماستەر بەکاردەهێنیت
# Visa & Master

نا: هاوکار رەحمان

لەگەڵ پێشکەوتنی ئەنتەرنێت و گۆرانکاریە خێراکان و دروست بونی بازرگانی ئەلیکترۆنی لەرێگای ئەنتەرنێت شێوازی کرینی شت و مەك و پێداویستیەکان گۆرانکاریان بەسەر داهات یەکێك لەمانە دروست کردنی ماستەرکارت و ڤیزاکارت بون کە بەهۆیانەوە دەتوانیت چ شتێکت دەوێت لە ئەنتەرنێت بیکریت بەڵام ئەم دوو کارتەش پێویستیان بە دروست کردن و دانانی وشەی نهێنی هەیە ، واتا تۆ دەبێت ناو پاسۆردێکە تایبەتی باوەرپێکراوی ئەم کۆمپانیایەت هەبێت جا چ ماستەر بێت یان ڤیزا بێت . من بۆیە ئەم بابەتە دەخەمە روو چونکە لە کوردستانیش خەریکە بازرگانی ئەلیکترۆنی پەرە دەسێنێت و کارتەکانی ماستەرو ڤیزا رەواجیان دەبێت و مەسەلەی بەکارهێنان و چونیەتی بەکارهێنانی زۆر گرنگە چونکە ئەگەر بەنەزانی بەکاری بهێنیت ئەوا توشی لە دەست چونی کارتەکە یان بەشێکی کارتەکە دەبیت چونکە لە ئەنتەرنێت هاکەرزێکی زۆر هەن وە ئەو خەڵکانەی بەدوای ئەم کارتانەدا دەگەرێن زۆرن بۆ ئەوەی هەر بەکارهێنەرێك توشی هەڵە نەبێت پێویستە بەوردی ئەم بابەتە بخوێنێتەوە چونکە تۆ لەکارتەکەت کەمێك پارە هەیە هەر هەڵەیەك بکەیت ئەوا لەوانەیە لە دەستت بچێت . کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت وەکو مامەڵەی دەرەوە نیە پەشیمان بیتەوە پارەکەت بگەرێتەوە یان حەزت پێ نەکرد بگەرێتەوە . لە ئەنتەرنێت کار کردن بەشێوەی ناردنی نامەیە کە نامەکە گەیشت ئەوا یەکسەر جێ بەجێ دەبێت . بۆیە لەهەر هەموویان گرنگتر بریتیە لە دڵنیا بون لە راستی زانیاریەکان ئینجا دوگمەی ناردن دابگریت . بۆ زیاتر زانیاریش پەیرەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکە :

١ - لە یەکەم هەنگاو بە هیچ شێوەیەك زانیاریەکان لەسەر کۆمپیوتەر خەزن نەکەیت تەنانەت ئەگەر سایتەکەش داوابکات ، تا ئەو رادەیەی کرینەکە رەتبکرێتەوە باشترە لەوەی زانیاریەکانت لە ناو کۆمپیوتەر بەجێ بمێنێت .

٢ - هەوڵبدە کرینی هەرکالایەك یان شتێك لە سایتە بەناوبانگەکان بێت

٣- لەپێشدا زانیاری کۆبکەرەوە ئینجا دەست بەکرینی شتەکان بکە .

٤- ئەگەر سایتەکە داوای ویلایەت یان هێمای پۆستی کرد ئەوا NA بنوسە

٥ - پێویستە لەوە دڵنیا بیت ئەوپارەی دەیدەیت بۆ کرینی شتێك کەمتربێت لە رەسیدەکەت

٦- ئەگەر کرینەکە فەشەلی هێنا مانای ئەوەنیە کە پارەکەت لە دەست چوو بەڵکو پارەکە ناروات بەڵام مانای وایە ئەم سایتە مامەڵە لەگەڵ ئەم کارتە ناکات .

٧- دلنیابە لەو سایتەی کە کرینەکەی دەکەیت کە سایتەکە بە (https) دەست پێ بکات واتا (S) لە دوای (http) هاتبێت

٨- ئەگەر هابەشیت کرد لە کرینی سایتێك یان هەرشتێکی بەردەوام لەسەر ئەنتەرنێت بەهیچ شێوەیەك کلیك لەسەر نوێبونەوەی پەیوەست نامەکە بەشێوەیەکی خۆکاری مەکە واتا لەکاتی تەواوبونی ماوەی پەیوەست نامە دوبارە خۆکاری نوێنەبێتەوە بەڵکو خۆت دوای تەواوبون نوێ بکەرەوە



# دروست کردنی یەکەم ئامێری چاپکردنی تایبەت بە کۆمپیتەر

ئا: فاخر محمود

خۆشەویستان هەر لەسەرتای دروست کردنی ئامێری کۆمپیوتەر زانایانی کۆمپیوتەر بیریان لەوەکردەوە کەچۆن بتوان چاپی پێ بکەن وە بۆ کاروباری خەلکی بەکاریبهێنن بۆیە کۆمپانیای زەبەلاحی hp کە یەکەم کۆمپانیایە لەجیهان لەبواری کۆمپیوتەر ، هەڵسا بەدروستکردنی ئامێری چاپ کە لەساڵی ١٩٨٤ دا کە ئامێرەکە یەکەم ئامێری hpبوو بۆکاری چاپەمەنی( hp 80 ) ناونرا وەسەرکەوتوانە کاری پێکرا .



وێنە ژمارە ( ١ )

بیرۆکەکە بەم جۆرە هاتە کایەوە یەکەم جار دەبێ ئامێرە کە( ram) رامی تێدابێت بۆ ئەوەی ئەو فەرمانەی پێی رادەسپێردرێت بچێتە ناو تۆمارگە وە ئنجا دەست بەچاپ بکات .



وێنە ژمارە ( ٢ )




وێنه
ژماره ( ٣ )

وه‌هه‌روه‌ها حوبر (tonar) بۆ رژاندنی بۆ سه‌ر كاغه‌زه‌كه وه پیتاندنی به‌هۆی لاینه‌وه وه‌پاشان ووشك كردنه‌وه‌ی نوسنه‌كه له‌سه‌ر كاغه‌زه‌كه به‌هۆی هیته‌ری فیلمی چاپه‌مه‌نیه‌كه



وێنه
ژماره ( ٤ )

پاش سه‌كه‌وتووی ئامێری چاپ بۆ كۆمپیوته‌ر كۆمپانیاكه هه‌لسا به‌بازرگانی كردن به ئامێره‌كه‌و وه‌دروستكردنی چه‌نده‌ها ئامێری چاپ وه گۆرانكاری و نوێترین ئامێر له‌وانه

HP ، HP 1300 ، HP 1200 ، HP 1100 ، HP 1000 ، HP 6MP ، HP L6، HP L5، HP L4) ، HP 5000 ، HP 2220 ، HP 2200 ، HP 2100 ، HP 2000 ، HP 1320 ، HP 1010 ، 1020 (HP 5120 ، HP 5100

# مەبەست لە رام چیە

نا: هەئمەت هاشم

هەموومان رۆژانەو چەندان جار ئەو کاتانەی باس لە خێرایی و ئەدای کۆمپیوتەر دەکرێت دەیبیستین کە رەگەزێکی سەرەکی ئەم کردارە رامە بەبێ ئەوەی زانیاری تەواوەمان هەبێت لە سەر فەرمانی رام یان بزانین رام چیەو ئەرك و فەرمانی چیە . رام کە بەهێمای (RAM) ناسراوە کە کورتکراوەی Random Access Memory بەمانای زاکیرەی گەینەری هەرەمەکی دێت فەرمانی سەرەکی بریتیە لە خەزنکردنی زانیاریەکان و فایلەکان و بەرنامە کارپێکراوەکان لەکاتی کارکردنی کۆمپیوتەر دا بۆ زیاتر رونکردنەوە ئێستا کە من ئەم بابەتە دەنوسم ئەم زانیاری و هەنگاوانە لە رام کۆگا دەبن تا ئەو کاتەی کۆمپیوتەر دەکوژێتەوە دواتر راستەخۆ هەموویان دەسرێنەوە جا ئەگەر ئەم زانیاریانە پێش کوژانەوە خەزن نەکرێن ئەوا لەناو دەچن . بەڵام رام تەنها فەرمانی خەزن کردن نیە بەلکو ئەم کردرە بۆ خێرایی وەڵام دانەوەی کارکردن و داواکانی بەکارهێنەرە لە کاتی کارکردنی لە کۆمپیوتەر . وەکو لەسەرەوە باسم کرد بەشێکی خێرایی کارکردنی کۆمپیوتەر پەیوەستە بە گەورەیی قەبارەی رام بەشێوەیەکی گشتی رام قەبارەکانی بریتین لە ( ٣٢ . ٦٤ ١٢٨ ٢٥٤ . ٥١٢ ) MB قەبارەی رام بە مێگابایت دەپێورێت ئێستا هەموو ئەو کەسانەی دەیانەوێت کۆمپیوتەرەکەیان بە تواناو بەئەداو بە خێرایەکی زۆر کاربکات قەبارەی رامەکانیان زیاد دەکەن بە گوێرەی توانای مادی خۆیان بۆنمونە ٥١٢ MBگەورەترین و بەتواناترە جا بۆ زانینی قەبارەی رامی کۆمپیوتەرەکەت پێویستە لە کۆنترۆل پەناڵەوە بچیتە سەر (System) پاشان بڕوانە وێنەی (١)



وێنە ١

پاشان دوو كليك لەسەر سيستەم دەكەين و بۆ كسێك دێت كليك لەسەر بەشی (General) دەكەين بروانە وێنـــەی (٢) لەم بەشەدا لەبەشی خوارەوەی دەبينين نوسراوە(MB of RAM ژمارەی رام ) ژمارەی رام مەبەست بەگوێرەی هەر كۆمپیوتەرێك دەگۆريت لە كۆمپیوتەری من نوسراوە (٥١٢ MB of RAM) وەك لەوێنەكەش ديارە .لە كۆتاييدا هەميشە ئەوەت لەبر بێت كە كۆمپیوتەرێكت كری با رامەكەی بەرزبێت .



وێنە ٢

## ئاگاداری

داوا لە هەموو خوێنەرانی گۆڤارەكەمان دەكەين ئەگەر هەر بەڕێزێك پێشنيار يان تێبينی يان سەرنجێكی هەيە يـان هـەر كەم و كوڕيەكيان بە دی كرد لە گۆڤارەكە با ئاگادارمان بكاتەوە بەم ناونيشانەی خوارەوە .

هەرێمی كوردستانی عێراق / ناو بازار بەرامبەر دەرگای قەڵا باڵەخانەی قەيسەری حـاجی يـەحيا نهۆمـی دووەم شـوێنی مەڵبەندی كۆمپیوتەر ئاراس يان بە ژمارە تەلەفۆنی ئاريا فۆن ٢٥٢٧٠٥٤ يان مۆبايلی كۆرەك ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ يـان بـە هـۆی پۆستی ئەلكترۆنی

Email aras_co_center@yahoo.com : يان computer_magazine_2005@yahoo.com

# Ram Converter
# بۆ گۆڕینی فۆرماتی دەنگ

ئا: زانیار عبدالجبار


وێنە ژمارە ( ١ )

یەکێك لەجۆرەفایلەکانی مۆبایل بریتیە لەجۆری Ram ئەوفایلەش دەنگە بێگومان ئێمە لەو ساتانە پێویستیمان بە بەرنامەیەك دەبێت کەئەوجۆرە فایلەمان بۆدروست بکات یاخود بەپێچەوانەوە ئەو فایلەمان بۆبگۆڕێت بۆجۆرێکی تر ئینجا چ بۆجۆری mpeg بێت یاخود بۆجۆری Avi بێت بۆنمونە ئەگەر بە مۆبایلێك چەند دەنگێك تۆمار بکەین پاشان بمانەوێت ئەودەنگانە لەناو مۆبایلەکە دەربێنین و کۆپی بکەین بۆسەر سیدیەك بێگومان پێویستمان بەبەرنامەیەك دەبێت کەئەوجۆرە فایلە بگۆڕێت بۆجۆرێکی وا کە بتوانرێت بەئاسانی بیگۆڕیت بۆجۆری wave لەبەرئەوەی ئەگەر بێت هەر فایلێکی دەنگ پێش کۆپی کردنی نەگۆرابێت بۆجۆری wave هیچ سودێکی نابێت چونکە بەهیچ ئامێرێك کارناکات جگە لەکۆمپیوتەر کارکردنیش لەسەر ئەوبەرنامەیە زۆر ئاسانە سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە سەیری بەرنامەکە بکە وێنەی ١



لەسەرەوە لە ناوەڕاست دوو بۆشایی لەسەریەك دیارە لەتەنیشت هەردوك بۆشایش Browse نوسراوە سەرەتا دێین Browse ی یەکەم دەکەینەوە لیستی یەکەمی هاردەکان دەبێتەوە بۆهێنانی فایلەکە بۆناو بەرنامەکە لیستی دوەمیش بۆدانانی فایلەکەیە بۆناو هاردەکان سەیری وێنەی ٢

وێنە ژمارە ( ٢ )

بکە ئینجا لەخوارەوەی بەرنامەکە Setting هەیە یەکجار کلیك بکە لەسەرەدەکەیت چاوەڕێ دەکەیت تاریندەرەکە تەواو دەبێت وێنە ٣




وێنە ژمارە ( ٣ )

## ئاگـــــــــاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ گۆڤارەکەمان تکایە لـە کـاتی وەرگێرانـی هـەر بابەتێك ئاماژە بکەن بە ناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە ئەینێرن بـە پێـچەوانەوە ئێمـە بـەر پرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك .

# چی بکەین ئەگەر مۆبایلەکەمان کەوتە ناو ئاو

دەریا حسێن سلێمانی

مۆبایل لەکەمترین ماوە بوو بە پێویستیەکی مرۆیی رۆژانەو هەموو جیهان ئێستا بەشێکی گرنگی کارو بەرنامەکانی بە مۆبایل رێك دەخات . تا ئەو رادەی رێژەیەکی زۆری خەڵك هەڵگری ئامێری مۆبایلن ئەمەش وادەکات کە کێشەو گرفتیش بێنە پێش ئەو کەسانەی کە مـۆبـایـل بـەکـاردێـنـن وەك لەکارکەوتن و سوتان و ون بون زۆری تریش یەکێك لەمانە کەوتنە ناو ئاوە زۆربەی کەس کاتێك مۆبایلەکەیان دەکەوێتە نـاو ئـاو وازی لـێدێـنـن بەو باوەرەی کە گوایە مۆبایلەکەیان دەسوتێت . ئەوەی راستی بێت کاتێك مۆبایل دەکەوێتە ناو ئاو ئەگەر زوو فریای بکەویت ئەوا ناسوتێت و لە دەستمان ناچێت ئەویش بە جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە .

هەنگاوی یەکەم : بەبێ ئەوەی مۆبایلەکە بکوژێنیتەوە بەبێ وەسـتـان هـەردوای هـێـنـانـە دەرەوەی لەناو ئاو ئەوا پیلەکەی جیابکەوە لە مۆبایلەکە و سیم کارتەکەی بە پەلە دەربێنە .

هەنگاوی دووەم : ئینجا زۆر بەوردی و زۆر بە ئارامی هەموو پارچەکانی مۆبایلەکە لێك جیا بکەرەوە تا کورترین پارچە واتا تا مۆبایلەکە لێك جیا دەبێتەوە جیای بکەرەوە .



هـەنـگـاوی سـێـیـەم : بـەشـی سـەرەکـی مـۆبـایـلـەکـە کـە بەسیستەم ناو دەبرێت یان لەژێر تیشکێکی خۆر دایبنێ یان لە نزیك گەرمیەك کە دەستت نزیك بکەیتەوە هەست بە گەرمی بکەیت .تاماوەی کاتژمێرێك بەلاَم زیاتر نەبێت .

هەنگاوی چوارەم : پاشان بە پەمپێك هەوایەك لە تـەواوی پـارچـەی مـۆبـایـلـەکـە بـدە بەشێوەیەك کە هەموو شوێنەکان بەر هەوا بکەون ، ئینجا ئەم پارچەیە کە بەسیستەم ناسراوە لـە نـاو پـارچـە کـلـێـنـکـسـێك بئاڵێنەو بە باشی وە بۆ ماوەی پانزە دەقیقە لەنزیك هەمان گەرمی دابنێ .

هـەنـگـاوی پـێـنـجـەم : تـەنـهـا پـارچـەی سیستەم لـەرێـگـای شەحنەوە بۆ ماوەی پێنج کاتژمێر بیخەرە سەر شەحن . لەوانەیە بپرسن چۆن ئەم مۆبایلە شەحن دەبێت کاتێك پیلەکەی لەسەر نەبێت بەلاَم ئێمە نابینین لەبەر ئەوەی مۆبایلەکە لێك هەڵوەشاوەتەوە ئەگەرنا تـەواوی ئـەو کـاتـە مۆبایلەکە شەحن دەبێت . لەم ماوەیەدا ئەم شەحنە تایبەت دەبـێـت بـە گـەرانـەوەو چارەسەرکردنی زیانەکانی سیستەم کە بەهۆی ئاوەوە لە مۆبایلەکە کەوتون

هەنگاوی شەشەم : پاش ئەم کردارانە دێین پارچەکانی تر دەبەستینەوەو دوبارە دەیخەینە سەر شەحن تا پیلەکە تەواو پڕ شەحن دەبێت لەم ماوەیەدا دەبینین ئاراستەی شەحنەکە لەسەر شاشەی مۆبایلەکە دەردەکەوێت . تا تەواو بونی شەحن بە هیچ شێوەیەك مۆبایلەکە داناگیرسێنین پاش تەواوبونی ئەم کردارە دێن مۆبایلەکە دادەگیرسێنین و دەبینین مۆبایلەکەمان بە سەلامەتی کاردەکات . لە کۆتاییدا هیوا دارم مۆبایلتان نەکەوێتە ناو ئاوەوە .....